شـــەرعی تێیـدایە وەك دەســـتووری ژیـانكردن لەســـەرئەو بەرنـامەو ڕێچكـەی قورئان، والله اعلم] .

## باب : (٤)

## (فَضْل الْقُرْآن وَالِاسْتِمَاعِ وَتَعَاهُدِ الْقُرْآنِ : فەزڵی قورئان و گوێ لێگرتنی و دووبارەکردنەوەی قورئان)

٦٠ - حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، وَعُثْمَانُ بْنُ أَبِي شَيْبَةَ قَالَا: نا وَكِيعُ بْنُ الْجَرَّاحِ، عَنْ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ، عَنْ عَاصِمِ بْنِ أَبِي النَّجُودِ، عَنْ زِرِّ بْنِ حُبَيْشٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «يُقَالُ لِصَاحِبِ الْقُرْآنِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ: اقْرَأْ، وَارْقَ، وَرَتِّلْ كَمَا كُنْتَ تُرَتِّلُ فِي الدُّنْيَا، فَإِنَّ مَنْزِلَتَكَ الْيَوْمَ عِنْدَ آخِرِ آيَةٍ تَقْرَؤُهَا» .

٦٠ - لە عبد اللهی کوڕی عمرو رضي الله عنه، لە پێغەمبەری خواوە ﷺ فەرمووی : (دەوترێ بە هاوەڵی قورئان لە ڕۆژی قیامەتدا، بخوێنەوە و بەرزبەوە بۆ پلە بەرزەکانی بەهەشت، وە لەسەرخۆ و بەئارامی بیخوێنە وەك چۆن لە دونیا دەتخوێند، بەڕاستی جێگا و مەکانی تۆ ئەمڕۆ لە کۆتا ئایەتە کە دەیخوێنی) .

**٦٢** - حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، نا الْفَضْـلُ بْنُ عِيَاضٍ، عَنِ الْأَعْمَشِ، عَنِ الْمِنْهَالِ بْنِ عَمْرٍو، عَنْ قَيْسِ بْنِ السَّكَنِ،... عَنْ أَبِي عُبَيْدَةَ، عَنْ عَبْدِ الله قَالَ: «مَا مِنْ مُسْلِمٍ يَقْرَأُ حَرْفًا مِنَ الْقُرْآنِ إِلَّا كُتِبَ لَهُ عَشَرُ حَسَنَاتٍ».

**٦٢** - عبد اللهی كوڕی مسعود رضي الله عنه دەفەرمووێ : (هیچ مسـولْمانێك نییە پیتێك لە قورئان بخوێنێتەوە ئیللا دە چاكەی بۆ دەنوسرێ).

**٦٣** - حَدَّثَنَا مِنْجَابُ بْنُ الْحَارِثِ، أنا أَبُو الْأَحْوَصِ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ السَّائِبِ، عَنْ أَبِي الْأَحْوَصِ قَالَ: قَالَ عَبْدُ الله: «تَعَلَّمُوا الْقُرْآنَ وَاتْلُوهُ، فَإِنَّ اللَّهَ يَأْجُرُكُمْ عَلَى تِلَاوَتِهِ بِكُلِّ حَرْفٍ عَشْرَ حَسَنَاتٍ، أَمَا أَنِّي لَا أَقُولُ لَكُمْ (الم) لَكِنْ فِي أَلِفٍ، وَلَامٍ، وَمِيمٍ».

**٦٣** - عبد اللهی كوڕی مسعود رضي الله عنه دەفەرمووێ : (خۆتان فێری قورئان خوێندنەوە بكەن وە بە لەسەرخۆیی و ڕێك و پێكی بیخوێننەوە، چونكە بەڕاستی الله عزَّ وَجَل پاداشتان دەداتەوە لەسەر خوێندنەوەكەی بۆ هەموو پیتێك دە چاكە، بەڵام من پێتان ناڵێم (الم) بەڵكو ئەلیف و لام و میمی تێدایە).

---

: واتە من ناڵێم ألم پیتێكە بەڵكو ئەلیف پێتێكە لام پیتێكە و میم پیتێكە والله اعلم.

٦٤ - حَدَّثَنَا أَبُو بَكْرِ بْنُ عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ زَنْجُوَيْهِ، نا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، أنا ابْنُ جُرَيْجٍ، عَنْ عَطَاءٍ، أَنَّهُ سَمِعَ ابْنَ عَبَّاسٍ يَقُولُ: «مَنِ اسْتَمَعَ إِلَى آيَةٍ مِنْ كِتَابِ اللَّهِ كَانَتْ لَهُ نُورًا يَوْمَ الْقِيَامَةِ».

٦٤ - عبد اللهی كوڕی عباس رضـي الله عنهما دەفەرمووێ : ئەوەی گوێ بگرێ لە ئایەتێك لە كتابی الله عزَّ وَجَل دەبێتە نور و ڕووناكی بۆی لە ڕۆژی قیامەت .

٦٥ - حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، نا عَبْدُ الْعَزِيزِ بْنُ مُحَمَّدٍ، عَنْ عَمْرِو بْنِ أَبِي عَمْرٍو، عَنْ حَبِيبِ بْنِ هِنْدَ الْأَسْلَمِيِّ، عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الزُّبَيْرِ، عَنْ عَائِشَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَنْ أَخَذَ السَّبْعَ فَهُوَ حَبْرٌ».

يَعْنِي بِذَلِكَ السَّبْعَ الطِّوَالَ مِنَ الْقُرْآنِ.

٦٥ - لە دایكمان عائشـة رضـي الله عنها كەوا رسـول الله ﷺ دەفەرمووێ : (ئەوەی حەوت سـوڕەتە سـەرەتاكەی قورئان بە جوانی لێ وورد ببێتەوە و تێ بگات ئەوا زانایە) .

مەبەستی حەوت سوڕەتە درێژەكەیە لە قورئان .

---

**تێبینی : عبد اللهی كوڕی مسـعود و عبد اللهی كوڕی عمرو عبداللهی كوڕی عباس و مجاهد سعیدی كوڕی جبیرو الضحاك جگە لەوان دەفەرموون : حەوت سـوڕەتەكە ئەمانەن : البقرة و آل عمران و النسـاء و المائدة و الأنعام الأعراف و یونس .**

**پاشـان لەبارەی ناوهێنانی ئەوحەوت سـورەتە عبد اللهى كـوڕی عباس و سـعیدی كـوڕی جبیر دەفەرموون : چونكـە الله عزَّوَجَل ڕوونی كـردۆتەوە تێیدا واجباتەكـان و سنوورەكـان و چیرۆكـی پێغەمبەران و حوكمەكـان .**

٦٦ - حَـدَّثَنَـا يَزِيـدُ بْنُ مَوْهَـبٍ، نـا عَبْـدُ اللَّهِ بْنُ وَهْـبٍ، عَنْ عَمْرِو بْنِ الْحَـارِثِ، أَنَّ أَبَـا يُونُسَ، حَـدَّثَـهُ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَـالَ: «أَيُحِـبُّ أَحَدُكُمْ أَنْ يَنْقَلِبَ إِلَى أَهْلِهِ بِخَلِفَتَيْنِ»؟

قَالُوا: نَعَمْ .

قَالَ: «فَآيَتَيْنِ مِنْ كِتَابِ اللَّهِ يَرْجِعُ بِهِمَا إِلَى أَهْلِهِ خَيْرٌ مِنْ خَلِفَتَيْنِ» .

٦٦ - لە أبو هـريـرة رضـي الله عنـه كـەوا پێغەمبەری خـوا ﷺ دەفەرمووێ : (ئـایـا یەكـێـك لە ئێوە پێی خۆشـە بگەڕێتەوە بۆ نـاو خانەوادەكـەی بە دوو وشـتری ئاوس [واتە هەردوو وشـترەكە سـكیان هەبێ] ؟)

وتیان : بەڵێ .

فەرمووی : (جـا بە دوو ئـایەت لە كـتـابی الله عزَّ وَجَـل بگەڕێتەوە پێیان بۆ لای خانەوادەكەی باشترە لەو دوو وشترە ئاوسە) .

٦٧ - حَدَّثَنَا مُزَاحِمُ بْنُ سَـعِيدٍ، أنا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ الْمُبَارَكِ، أنا مُوسَى بْنُ عَلِيِّ بْنِ رَبَاحٍ قَالَ: سَـمِعْتُ أَبِي يَقُولُ: سَـمِعْتُ عُقْبَةَ بْنَ عَامِرٍ يَقُولُ: خَرَجَ

عَلَيْنَا رَسُــولُ اللَّهِ ﷺ، وَنَحْنُ فِي الصُّــفَّةِ، فَقَالَ: «أَيُّكُمْ يَغْدُو إِلَى بُطْحَانَ أَوِ الْعَتِيقِ فَيَـأْتِي كُلَّ يَوْمٍ بِنَـاقَتَيْنِ كَوْمَـاوَيْنِ زَهْرَاوَيْنِ فِي غَيْرِ إِثْمٍ، وَلَا قَطِيعَـةِ رَحِمٍ؟»

قَالُوا: كُلُّنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ نُحِبُّ ذَلِكَ .

قَالَ رَسُــولُ اللَّهِ ﷺ: «فَلَئِنْ يَغْدُو أَحَدُكُمْ إِلَى الْمَسْـجِدِ، فَيَتَعَلَّمَ آيَتَيْنِ مِنْ كِتَابِ اللَّهِ خَيْرٌ لَـهُ مِنْ نَـاقَتَيْنِ، وَثَلَاثٌ خَيْرٌ مِنْ ثَلَاثٍ، وَأَرْبَعٌ خَيْرٌ مِنْ أَرْبَعٍ مِنْ أَعْدَادِهِنَّ مِنَ الْإِبِلِ» .

٦٧ - عقبة ــى كـوڕى عـامر رضي الله عنه دەفەرمووێ : ڕسـول الله ﷺ هـاته دەرەوە بۆ لامـان، وە ئێمە لە (الصـــفـة) بووین، جـا فـەرمووى : (كێ لە ئێوە حەزدەكـات بچێتە دەرەوە لە بەيـانيـان هەموو ڕۆژێـك بۆ بطحـان يـان العقيق و هەموو ڕۆژێـك دوو وشـــترى مێينە لەگەڵ خۆى بهێنێتەوە، بەبێ ئەوەى تووشــى گوناهو تاوان، يان پچڕانى ســيلەى ڕەحم بێت؟)

جا وتيان : ئەى ڕسول الله! هەموومان ئەوەمان حەز لێيە .

ڕســـول الله ﷺ فەرمووى : (جا بزانن يەكێك لە ئێوە دەربچێت بۆ مزگەوت، جا دوو ئايەت فێر ببێت لە كـتابى الله عزَّ وَجَل باشـترە بۆى لەو دوو وشـترە مێينەيە، وە سێ [ئايەت] باشـترە بۆى لە سێ وشـترى مێينە، وە چوار [ئايەت] باشترە بۆى لە چوار وشترى مێينە، وە هەتا دوايى) .

٦٨ - حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ مَوْهَبٍ، نا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ وَهْبٍ، نا مُوسَى بْنُ عَلِيِّ بْنِ رَبَاحٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ قَالَ: خَرَجَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وَنَحْنُ فِي الصُّفَّةِ، فَقَالَ: «أَيُّكُمْ يُحِبُّ أَنْ يَغْدُوَ إِلَى بُطْحَانَ، أَوِ الْعَتِيقِ؟»، فَذَكَرَ مِثْلَهُ.

٦٨ - عقبة ـى كوڕى عامر رضي الله عنه دەفەرمووێ: رسول الله ﷺ هاتە دەرەوە بۆ لامان وە ئێمە لە (الصفة) بووين، جا فەرمووى: (كێ لە ئێوە حەزدەكات بچێتە دەرەوە لە بەيانيان بۆ بطحان يان العقيق؟) بەهەمان شێوەی پێشوو باسيكرد.

٦٩ - حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ رَاهَوَيْهِ، نا وَكِيعٌ، نا الْأَعْمَشُ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ إِذَا رَجَعَ إِلَى أَهْلِهِ أَنْ يَجِدَ ثَلَاثَ خَلِفَاتٍ عِظَامٍ سِمَانٍ؟»

فَقَالُوا: نَعَمْ.

قَالَ «فَثَلَاثُ آيَاتٍ يَقْرَأُهُنَّ أَحَدُكُمْ فِي صَلَاتِهِ خَيْرٌ لَهُ مِنْ ثَلَاثِ خَلِفَاتٍ عِظَامٍ سِمَانٍ».

٦٩ - لە أبو هريرة رضي الله عنه لە رسول الله ـوە ﷺ فەرمووى: (ئايا هيچ يەكێك لە ئێوە حەزناكات سێ حوشتری گەورەی قەڵەوی ئاوس ببينێت كاتێك دەگەڕێتەوە بۆ ناو خێزانەكەی؟)

جا وتيان: بەڵێ.

فەرمووی : (سێ ئایەت لە قورئان کە دەیخوێنن لەناو نوێژەکەتاندا باشترە بۆتان لە سێ حوشتری گەورەی قەڵەو) .

٧٠ - حَدَّثَنَا أَبُو بَكْرِ بْنُ أَبِي شَيْبَةَ، نا وَكِيعٌ، عَنِ الْأَعْمَشِ مِثْلَهُ .

٧٠ - بەهەمان شێوەی پێشوو .

٧١ - حَدَّثَنَا عُثْمَانُ بْنُ أَبِي شَيْبَةَ، نا حُسَيْنُ بْنُ عَلِيٍّ، عَنْ زَائِدَةَ، عَنْ سُلَيْمَانَ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: «هَلْ يُحِبُّ أَحَدُكُمْ إِذَا رَجَعَ إِلَى أَهْلِهِ، أَنْ يَجِدَ ثَلَاثَ خَلِفَاتٍ عِظَامًا سِمَانًا؟» .

قَالَ: قُلْنَا: نَعَمْ .

قَالَ: «ثَلَاثُ آيَاتٍ يَقْرَؤُهُنَّ فِي الصَّلَاةِ خَيْرٌ مِنْهُنَّ» .

٧١ - لە أبو هريرة رضي الله عنه لە رسول الله ـەوە ﷺ فەرمووی : (ئایا یەکێك لە ئێوە پێی خۆشە سێ حوشتری گەورەی قەڵەو ببینێت کاتێك دەگەڕێتەوە بۆ ناو خێزانەکەی؟)

وتی : وتمان : بەڵێ .

فەرمووی : (سێ ئایەت لە قورئان کە دەیخوێنن لەناو نوێژەکەتاندا باشترە بۆتان لەو سێ حوشترە) .

**٧٢** - حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ رَاهَوَيْهِ قَالَ: قُلْتُ لِأَبِي أُسَامَةَ: حَدَّثَكُمْ عَبْدُ الْحَمِيدِ بْنُ جَعْفَرٍ، عَنِ الْمَقْبُرِيِّ، عَنْ عَطَاءٍ، مَوْلَى أَبِي أَحْمَدَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: بَعَثَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بَعْثًا ذَا عِدَّةٍ، فَاسْتَقْرَأَ كُلَّ رَجُلٍ مِنْهُمُ الْقُرْآنَ، فَأَتَى عَلَى أَحْدَثِهِمْ سِنًّا.

فَقَالَ: مَا مَعَكَ مِنَ الْقُرْآنِ؟

قَالَ: مَعِي كَذَا، وَمَعِي كَذَا، وَمَعِي سُورَةُ الْبَقَرَةِ.

فَقَالَ: «أَمَعَكَ سُورَةُ الْبَقَرَةِ؟»

قَالَ: نَعَمْ.

قَالَ: «اذْهَبْ فَأَنْتَ أَمِيرُهُمْ».

فَقَالَ رَجُلٌ: وَاللَّهِ مَا مَنَعَنِي أَنْ أَتَعَلَّمَ الْقُرْآنَ إِلَّا خَشْيَةَ أَنْ لَا أَقُومَ بِهِ.

فَقَالَ: «اقْرَءُوا الْقُرْآنَ وَتَعَلَّمُوهُ، وَإِنْ لَمْ تَقُومُوا بِهِ، فَإِنَّ مَثَلَ مَنْ تَعَلَّمَ الْقُرْآنَ، وَقَرَأَهُ، وَقَامَ بِهِ، كَمَثَلِ جِرَابٍ مَمْلُوءٍ مِسْكًا، يَفُوحُ مِنْهُ رِيحُ الْمِسْكِ، وَمَثَلُ مَنْ تَعَلَّمَ الْقُرْآنَ، وَرَقَدَ، وَهُوَ فِي جَوْفِهِ، كَمَثَلِ حَامِلِ جِرَابٍ أُوكِيَ عَلَى مِسْكٍ».

**٧٢** - أبو هريرة رضي الله عنه دەفەرمووێ: رسول الله كۆمەڵە ژمارەيەك جەنگاوەری وەكو نێردراو نارد، جا داوای خوێندنی قورئانی لە هەموویان كرد **[لەوەی لەبەریەتی لە قورئان]**، تا هاتە لای بچووكترينيان لە تەمەن و پێی فەرموو: چيت لەبەرە لە قورئان؟

وتی: ئەو سورەتە و ئەو سورەتەم لەبەرە لەگەڵ سورەتی البقرة.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : (ئایا سورەتی البقرة ت لەبەرە؟)

وتی : بەڵێ .

فەرمووی : (برۆ تۆ پێشەوایانی) .

پیاوێك وتی : سوێند به الله تعالى هیچ شتێك ڕێگری لێنەكردم لە فێربوونی قورئان جگە لەوەی ترسام نەتوانم پێی هەڵبستم [واتە نەتوانم لە شەونوێژدا بیخوێنم] .

رسول الله ﷺ فەرمووی : (قورئان بخوێننەوە و خۆتان فێر بكەن، ئەگەر پێشی هەڵنەستن [لە نوێژدا]، چونكە بێگومان نمونەی ئەو كەسەی خۆی فێرە قورئان خوێندن كردووە و خوێندوویەتیەوە و پێی هەستاوە [لە نوێژدا] وەكو جانتایەك وایە پڕبێت لە میسك بۆنی میسك بە شوێنەكەدا بڵاو بكاتەوە، وە نمونەی ئەو كەسەی خۆی فێرە قورئان خوێندن كردووە و پاشان دەخەوێت لەكاتێكیدا لەبەریەتی وەكو جانتایەكی پڕ میسكە كە سەری توند كراوە و داخراوە) .

٧٣ - حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ، نا ابْنُ أَبِي مَرْيَمَ، نا ابْنُ لَهِيعَةَ، عَنْ يَزِيدَ بْنِ أَبِي حَبِيبٍ، عَنْ أَبِي الْخَيْرِ، أَنَّهُ سَمِعَ سَلَمَةَ بْنَ قَيْصَرٍ الْحَضْرَمِيَّ، وَكَانَ أَوَّلَ أَمِيرٍ عَلَى إِيلِيَا يَقُولُ عَلَى مِنْبَرِهَا: «مَا أَنْزَلَ اللَّهُ فِي التَّوْرَاةِ، وَلَا فِي الْإِنْجِيلِ، وَلَا فِي الزَّبُورِ آيَةً هِيَ أَعْظَمُ مِنْ ﴿اللَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ﴾ [البقرة: ٢٥٥]، حَتَّى خَتَمَ الْآيَةَ» .

٧٣ - له أبي الخير كەوا بيستوويەتی له سلمة ـــی كوڕی قيصر الحضـــرمي كه يەكەم ئەمير بوو لەســـەر ئيليا [ناوی شـــارێكه له بيت المقدس] لەسەر مينبەرەكەی دەيوت : الله عزَّ وَجَل داينەبەزاندووە نە لە تەوراتدا، نە له ئينجيلدا، نە له زەبوردا ئايەتێك كه گەورەتر بێت له ﴿اللَّهُ لَا إِلَـهَ إِلَّا هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ﴾ [البقرة: ٢٥٥]، هەتاوەكو ئايەتەكەی تەواوكرد .

٧٤ - حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ إِسْـــمَاعِيلَ، نا ابْنُ أَبِي مَرْيَمَ، نا ابْنُ لَهِيعَةَ، أَخْبَرَنِي الْحَارِثُ بْنُ يَزِيدَ، عَنْ عَلِيِّ بْنِ رَبَاحٍ، عَنْ رَبِيعَةَ الْجُرَشِـيِّ، قَاضِـي الْأَرْبَاعِ فِي زَمَانِ مُعَاوِيَةَ بْنِ أَبِي سُفْيَانَ قَالَ: سُئِلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَيُّ الْقُرْآنِ أَفْضَلُ؟

قَالَ: «السُّورَةُ الَّذِي يُذْكَرُ فِيهَا الْبَقَرَةُ» .

قَالَ: فَأَيُّ آيِ الْقُرْآنِ أَفْضَلُ؟

قَالَ: «آيَةُ الْكُرْسِيِّ وَخَوَاتِمُ سُورَةِ الْبَقَرَةِ، أُنْزِلَتْ مِنْ تَحْتِ الْعَرْشِ» .

٧٤ - له ربيعة الجرشـــي قازی (الأرباع) له ســـەردەمی خەلافەتی معاويەی كوڕی أبو سوفيان رضي الله عنهما وتی : پرسيار كرا له رسول الله ﷺ كام سورەتەی قورئان گەورەترينە؟

فەرمووی : (ئەو سورەتەی باسی مانگاكەی تێدا كراوە) .

وتی : ئەی چ ئايەتێكی قورئان گەورەترينە؟

فەرمووی : (ئایەتی الكرسي و كۆتایی سورەتی البقرة، دابەزیوە لە ژێر عەرش) .

٧٥ - حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ سَيَّارٍ، نا أَحْمَدُ بْنُ صَالِحٍ، نا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ وَهْبٍ، أَخْبَرَنِي عَمْرُو بْنُ الْحَارِثِ، وَابْنُ لَهِيعَةَ، عَنْ يَزِيدَ بْنِ أَبِي حَبِيبٍ، عَنْ سَيَّارِ بْنِ سَعْدٍ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِنَّ الشَّيْطَانَ يَخْرُجُ مِنَ الْبَيْتِ إِذَا سَمِعَ سُورَةَ الْبَقَرَةِ تُقْرَأُ فِيهِ» .

٧٥ - لە أنس ـی كوڕی مالك رضي الله عنه لە رسول الله ـەوە ﷺ فەرمووی : (بێگومان شەیتان دەردەچێت لەو ماڵەی كە دەبیستێت سورەتی البقرة ی تێدا دەخوێنرێت) .

٧٦ - حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْعَلَاءِ، نا يَحْيَى بْنُ آدَمَ، عَنْ إِسْرَائِيلَ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ أَبِي الْأَحْوَصِ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: «لَوْ جُعِلَ لِأَحَدِكُمْ خَمْسُ قَلَائِصَ، وَيُصَلِّي الْغَدَاةَ بِالْقَرْيَةِ لَبَاتَ يَقُولُ لِأَهْلِهِ: قَدْ آنَ لِي أَنْ أَنْطَلِقَ، وَاللَّهِ لَئِنْ يَغْدُو فَيَتَعَلَّمَ خَمْسَ آيَاتٍ مِنْ كِتَابِ اللَّهِ، لَهِيَ خَيْرٌ مِنْ خَمْسِ قَلَائِصَ، وَخَمْسِ خَلَائِصَ» .

٧٦ - عبد الله ـی كوڕی مسعود رضي الله عنه دەفەرمووێ : ئەگەر یەكێك لە ئێوە پێنج وشتری مێینەی گەنجی هەبێت، و نوێژی بەیانی لە گوندەكەی بكات و پاشان بڵێت بە خانەوادەكەی ئێستا كاتیەتی دەربچم، سوێند بە الله تعالى بەیانی بكاتەوە جا پێنج ئایەت فێرببێت لە

كتابى الله عزَّ وَجَل باشتره له پێنج وشترى مێينهى گهنج، وه پێنج وشترى مێينه .

٧٧ - حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْحَسَنِ الْبَلْخِيُّ قَالَ: ثنا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ الْمُبَارَكِ، أَخْبَرَنَا هَمَّامٌ، عَنْ قَتَادَةَ قَالَ: «لَمْ يُجَالِسْ هَذَا الْقُرْآنَ أَحَدٌ إِلَّا قَامَ عَنْهُ بِزِيَادَةٍ، أَوْ نُقْصَانٍ، قَضَى اللَّهُ تَعَالَى الَّذِي قَضَى، شِفَاءً وَرَحْمَةً لِلْمُؤْمِنِينَ، وَلَا يَزِيدُ الظَّالِمِينَ إِلَّا خَسَارًا» .

٧٧ - قتادة دهڵێت : ئهم قورئانه هاوهڵێتى هيچ كهسێ ناكات ئيللا كاتێ دانيشتنى لهگهڵ تهواو بێت به سوودمهنديهوه تهواو دهبێت يان به زهرهرمهندى، الله بڕيارى لهوه داوه كه نوسيويهتى، شيفا و ڕهحمهته بۆ ئيمانداران، وه ستهمكارانيش هيچ شتێكيان لێ زياد نابێت جگه له خهسارهتمهندى و زهرهر نهبێت .

---

**ئيمانداران سوود وهردهگرن لهقورئان بهو زانست و موژدانهى تێيدايه، كافرانيش لێى زهرهرمهندن چونكه ڕقيان زياتر ئهستوور دهبێت بهو باسانهى دهربارهيان هاتووه له سزا و توڕهيى الله تعالى لهسهريان، والله اعلم .**

٧٨ - حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْحَسَنِ، أنا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ الْمُبَارَكِ، أَخْبَرَنَا سُفْيَانُ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ مُرَّةَ، عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: «إِذَا أَرَدْتُمُ الْعِلْمَ، فَأَثِيرُوا الْقُرْآنَ، فَإِنَّ فِيهِ عِلْمَ الْأَوَّلِينَ، وَالْآخِرِينَ» .

٧٨ - عبد الله ی كوڕی مسعود رضي الله عنه دەفەرمووێ : ئەگەر زانستتان دەوێت ئەوا بكۆڵنەوە لە قورئان [بیربكەنەوە لە ماناكەی و تەفسیرو خوێندنەوەكەی]، چونكە بەڕاستی زانستی سەرەتا و كۆتای تێدایە .

٧٩ - حَدَّثَنَا أَبُو جَعْفَرٍ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدٍ النُّفَيْلِيُّ قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي سَيَّارٍ، عَنْ عَمْرِو بْنِ مُرَّةَ، عَنْ أَبِي الْبَخْتَرِيِّ، عَنِ الْحَارِثِ، عَنْ عَلِيٍّ قَالَ: قِيلَ لِنَبِيِّ ﷺ: إِنَّ أُمَّتَكَ سَتُفْتَتَنُ بَعْدَكَ .

فَسَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَوْ سُئِلَ: فَمَا الْمَخْرَجُ مِنْ ذَلِكَ؟

قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «كِتَابُ اللَّهِ عز وجل الْعَزِيزُ،لَا يَأْتِيهِ الْبَاطِلُ مِنْ بَيْنَ يَدَيْهِ، وَلَا مِنْ خَلْفِهِ، تَنْزِيلٌ مِنْ حَكِيمٍ حُمَيْدٍ .

مَنِ ابْتَغَى الْعِلْمَ فِي غَيْرِهِ أَضَلَّهُ اللَّهُ، وَمَنْ وَلِيَ هَذَا الْأَمْرَ مِنْ جَبَّارٍ فَحَكَمَ بِغَيْرِهِ قَصَمَهُ اللَّهُ تَعَالَى، وَهُوَ النُّورُ الْمُبِينُ، وَالذِّكْرُ الْحَكِيمُ، وَالصِّرَاطُ الْمُسْتَقِيمُ فِيهِ خَبَرُ مَا قَبْلَكُمْ، وَنَبَأُ مَا بَعْدَكُمْ، وَحُكْمُ مَا بَيْنَكُمْ، وَهُوَ الْفَصْلُ لَيْسَ بِالْهَزْلِ، وَهُوَ الَّذِي سَمِعَتْهُ الْجِنُّ فَلَمْ يَتَنَاهَوْا أَنْ قَالُوا: ﴿إِنَّا سَمِعْنَا قُرْآنًا عَجَبًا * يَهْدِي إِلَى الرُّشْدِ﴾ [الجن: ٢]، لَا يَخْلَقُ عَلَى طُولِ الرَّدِّ، وَلَا تَنْقَضِي عِبَرُهُ، وَلَا تَفْنَى عَجَائِبُهُ» .

ثُمَّ قَالَ عليه السلام لِلْحَارِثِ: «خُذْهَا يَا أَعْوَرُ» .

٧٩ - له ئيمامی علي ــەوە رضي الله عنه فەرمووی : وترا بە پێغەمبەر ﷺ : بەڕاستی ئوممەتەکەت تووشی فیتنە دەبن لە دوای تۆ .

جا پرسیاری کرد لە رسول الله ﷺ یان پرسیاری لێکرا : چۆن لێی دەربچین لەوکاتەدا؟

فەرمووی : (کتابی الله عزَّ وَجَل العزیز، هەرگیز ڕەفتار و گوفتاری هیچ و پوچی تێ نایەت، نە لە پێش خۆیی و، نە لە پاش خۆی، چوون لە لایەن خوایەکی قسە لەجێ و هەمیشە سوپاسکراوەوە نێرراوە .

ئەوەی داوای زانسـت بکـات بە جگە لە قورئان الله عزَّ وَجَل گومڕای دەکـات، وە ئەوەی ئەم ئەمرە [خەلافەت] بگرێتە دەسـت لە خۆبەگەورە زانێك جا حوکم بکـات بە جگە لەو [قورئان] الله عزَّ وَجَل بە هیلاکی دەبات .

وە ئەو قورئانە ڕووناکیەکی ئاشکرا و یادخەرەوەیەکی حەکیمە [بەتاڵە لە جیاوازی و بەریەککەوتن] وە صـراط المستقیم ــه، هەواڵی پێش و پاشی ئێوەی تێدایە، وە حوکم دەکات لە نێوانتان و جیاکەرەوەیە [لە نێوان حەق و باتڵ] گاڵتەجاڕی نییە، وە ئەم قورئانە ئەوەیە جننەکان بیستیان هێشتا تەواویان نەکرد وتیان : ﴿إِنَّا سَمِعْنَا قُرْآنًا عَجَبًا * يَهْدِي إِلَى الرُّشْدِ﴾ [الجن] بەزۆر دووبارە کردنەوەی بێزار نابێت، وە پەند و عیبرەتەکەی لەناو ناچێت و سەرسامییەکەی لەناو ناچێ .

پاشان ئیمامی علي رضي الله عنه بە حارث ی وت : بیگرە ئەی أعور).

٨٠ - حَدَّثَنَا مُحَمَّدٌ قَالَ: ثنا الْحَكَمُ بْنُ بَشِيرِ بْنِ سَلْمَانَ قَالَ: حَدَّثنَا عَمْرُو بْنُ الْقَيْسِ الْمُلَائِيُّ، ...، عَنْ عَمْرِو بنِ مُرَّةَ الْجُمَيْلِيِّ، عَنْ أَبِي الْبَخْتَرِيِّ، عَنِ ابْنِ أَخِي الْحَارِثِ، عَنِ الْحَارِثِ، عَنْ عَلِيٍّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «قَالَ جِبْرِيلُ: سَيَكُونُ فِي أُمَّتِكَ فِتْنَةٌ .

قُلْتُ: مَا الْمَخْرَجُ مِنْهَا يَا جِبْرِيلُ؟

قَالَ: كِتَابُ اللَّهِ فِيهِ نَبَأُ مَا قَبْلَكُمْ، وَخَبَرُ مَا بَعْدَكُمْ، وَحُكْمُ مَا بَيْنَكُمْ مَنْ وَلِيَ هَذَا الْأَمْرَ مِنْ جُبَارٍ فَقَضَى فِيهِ بِغَيْرِهِ قَصَمَهُ اللَّهُ، وَمَنِ ابْتَغَى الْهَدْيَ فِي غَيْرِهِ أَضَلَّهُ اللَّهُ عز وجل، وَهُوَ النُّورُ الْمُبِينُ، وَالذِّكْرُ الْحَكِيمُ، وَالصِّرَاطُ الْمُسْتَقِيمُ، هُوَ الْفَصْلُ لَيْسَ بِالْهَزْلِ هُوَ الَّذِي سَمِعَتْهُ الْجِنُّ فَلَمْ يَتَنَاهَوْا أَنْ قَالُوا: ﴿إِنَّا سَمِعْنَا قُرْآنًا عَجَبًا﴾ [**الجن: ١**]، هُوَ الَّذِي لَا يَخْلَقُ عَلَى طُولِ الرَّدِّ، وَلَا تَنْقَضِي عَجَائِبُهُ» .

ثُمَّ قَالَ لِلْحَارِثِ: «خُذْهَا يَا أَعْوَرُ» .

٨٠ - له ئیمامی عەلي رضي الله عنه فەرمووی : رسول الله ﷺ فەرمووی : (جبريل عليه السلام فەرمووی بەڕاستی ئوممەتەکەت توشی فیتنه دەبن) .

وتم : چۆن لێی دەربچن ئەی جبریل؟

فەرمووی : (کتابی الله عزَّ وَجَل هەواڵی پێش و پاشی ئێوەی تێدایه، وه حوکم دەکات لە نێوانتان، وه ئەوەی ئەم ئەمرە **[خەلافەت]** بگرێته

دەست لە خۆبەگەورە زانێك جا حوكم بكات بە جگە لەو [قورئان] الله عزَّ وَجَل بە هیلاكی دەبات، ئەوەی داوای ڕێنموونی بكات بە جگە لە قورئان الله عزَّ وَجَل گومڕای دەكات، وە ئەو قورئانە ڕووناكیەكی ئاشكرا و یادخەرەوەیەكی حەكیمە [بەتاڵە لە جیاوازی و بەریەككەوتن] وە صراط المستقیمە ، وە حوكم دەكات لە نێوانتان و جیاكەرەوەیە

[لە نێوان حەق و باتڵ] گەمە و گاڵتە نییە [واتە: بەبێ هودە نەنێراوە، بەڵكو دەبێ بكرێتە بەرنامەی ژیانی هەردوو دونیا]، وە ئەم قورئانە ئەوەیە جننەكان بیستیان هێشتا تەواو نەكرا وتیان : ﴿إِنَّا سَمِعْنَا قُرْآنًا عَجَبًا﴾ [الجن: ١]، بەزۆر دووبارە كردنەوەی بێزار نابیت، وە پەند و عیبرەتەكەی لەناو ناچێت و سەرسامییەكەی لەناو ناچێ .

پاشان ئیمامی علي رضي الله عنه بە حارث ی وت : بیگرە ئەی أعور).

٨١ - حَدَّثَنَا أَبُو بَكْرٍ، وَعُثْمَانُ قَالَا: حَدَّثَنَا حُسَيْنُ بْنُ عَلِيٍّ، عَنْ حَمْزَةَ الزَّيَّاتِ، عَنْ أَبِي الْمُخْتَارِ الطَّائِيِّ، عَنِ ابْنِ أَخِي الْحَارِثِ، عَنِ الْحَارِثِ قَالَ: دَخَلْتُ الْمَسْجِدَ، فَإِذَا النَّاسُ يَخُوضُونَ فِي الْأَحَادِيثِ .

قَالَ: فَدَخَلْتُ عَلَى عَلِيٍّ عليه السلام .

فَقُلْتُ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ أَمَا تَرَى النَّاسَ يَخُوضُونَ فِي الْأَحَادِيثِ؟

قَالَ: فَقَالَ:فَقَدْ فَعَلُوهَا؟

قُلْتُ: نَعَمْ .

قَالَ: أَمَا أَنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «إِنَّهَا سَتَكُونُ فِتَنٌ» .

قَالَ: قُلْتُ: فَمَا الْمَخْرَجُ مِنْهَا يَا رَسُولَ اللَّهِ؟

قَالَ: «كِتَابُ اللَّهِ تَعَالَى فِيهِ خَبَرُ مَا قَبْلَكُمْ، وَنَبَأُ مَا بَعْدَكُمْ، وَحُكْمُ مَا بَيْنَكُمْ، هُوَ الْفَصْلُ لَيْسَ بِالْهَزْلِ»

٨١ - حارث دەڵێت : چوومە ناو مزگەوتەوە، بینیم خەڵکی گاڵتە دەکەن بە فەرموودە .

وتی : جا چوومە لای ئیمامی علی علیه السلام .

جا وتم : ئەی پێشـــەوای ئیمانداران ئایا نابینیت خەڵکی گاڵتە دەکەن بە فەرموودە؟

وتی : جا وتی : بەڕاست ئەو کارەیان کرد؟

وتم : بەڵێ .

وتی : بەڵام من بیســـتم رســـول الله ﷺ دەیفەرموو : (بێگومان فیتنە سەرهەڵدەدات) .

وتی : وتی [ئیمامی علي رضـي الله عنه] : چۆن لێی دەربچین ئەی رســـول الله ﷺ؟

فەرمووی : (كـتابی اللە عزَّ وَجَل هەواڵی پێش و پاشی ئێوەی تێدایە، وە حوكم دەكـات لە نێوانتـان و جیاكـەرەوەیە [لە نێوان حەق و باتڵ] گاڵتەجاڕ نییە) .

٨٢ - حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَـعِيدٍ، حَدَّثَنَا جَعْفَرُ بْنُ سُـلَيْمَانَ، عَنْ ثَابِتٍ قَالَ: «كَانَ أَنَسٌ إِذَا خَتَمَ الْقُرْآنَ جَمَعَ أَهْلَهُ وَوَلَدَهُ فَدَعَا لَهُمْ» .

٨٢ - ثابت البناني دەڵێت : أنس كوڕی مالك رضـي الله عنه كـاتێ قـورئـانی خەتم دەكـرد مـاڵ ومنـداڵی كـۆدەكـردەوە و دوعـای بـۆ دەكـردن .

٨٣ - حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَـعِيدٍ قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ لَهِيعَةَ، عَنْ خَالِدِ بْنِ أَبِي عِمْرَانَ، عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ قَالَ: سَـمِعْتُ رَسُـولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «سَتَكُونُ فِتْنَةٌ» .

فَقُلْتُ: مَا الْمَخْرَجُ مِنْهَا؟

فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «كِتَابُ اللَّهِ عز وجل فِيهِ نَبَأُ مَا قَبْلَكُمْ، وَخَبَرُ مَا بَعْدَكُمْ، وَحُكْمُ مَا بَيْنَكُمْ، وَهُوَ الْفَصْلُ لَيْسَ بِالْهَزْلِ» .

فَذَكَرَ مِثْلَ حَدِيثِ الْحَارِثِ غَيْرَ أَنَّ الْحُرُوفَ مُقَدَّمٌ، وَمُؤَخَّرٌ .

٨٣ - لە علي كـوڕی ئەبو طالب ـــەوە رضـي الله عنه دەفەرمووێ : بیستم رسول اللە ﷺ دەیفەرموو : (بێگومان فیتنە سەرهەڵدەدات) .

وتم : چۆن لێی دەربچین؟

رسول الله ﷺ فەرمووی : (كتابی الله عزَّ وَجَل هەواڵی پێش و پاشی ئێوەی تێدایە، وە حوكم دەكات لە نێوانتان و جیاكەرەوەیە [لە نێوان حەق و باتڵ] گاڵتەجاڕ نییە .

جا باسی كرد هاوشێوەی فەرموودەی حارث تەنها وشەكان پێش و پاش كراوە) .

## باب : (٥)

## (خَتْمِ الْقُرْآنِ، وَمَا جَاءَ فِيهِ : دەربارەی خەتم کردنی قورئان و ئەوەی دەربارەی هاتووە)

٨٤ - حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْحَسَـــنِ الْبَلْخِيُّ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ الْمُبَارَكِ، أَخْبَرَنَا هَمَّامٌ، عَنْ ثَابِتٍ، عَنْ أَنَسٍ، أَنَّهُ «كَانَ يَجْمَعُ أَهْلَهُ عِنْدَهُ إِذَا خَتَمَ الْقُرْآنَ» .

٨٤ - لە ثابت ـــەوە لە أنس رضـي الله عنه : کەوا خانەوادەکەی کۆدەکردەوە لە لای خۆی کاتێك قورئانی خەتم دەکرد .

٨٥ - حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، ثنا وَكِيعُ بْنُ الْجَرَّاحِ، عَنْ مِسْـعَرٍ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسٍ، أَنَّهُ «كَانَ إِذَا خَتَمَ الْقُرْآنَ جَمَعَ أَهْلَهُ» .

قَالَ مِسْعَرٌ: أُرَاهُ قَالَ دَعَا .

٨٥ - لە قتادة لە أنس رضـــي الله عنه : کەوا ئەو کاتێك قورئانی خەتم دەکرد خانەوادەکەی کۆدەکردەوە .

مسعر دەڵێت : وایدەبینم وتی دوعای دەکرد .

٨٦ - حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا وَكِيعُ بْنُ الْجَرَّاحِ، عَنْ مِسْعَرٍ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسٍ أَنَّهُ «كَانَ إِذَا خَتَمَ الْقُرْآنَ جَمَعَ أَهْلَهُ» أَوْ نَحْوَهُ .

٨٦ - له قتادة له أنس رضي الله عنه : كەوا ئەو كاتێك قورئانی خەتم دەكرد خانەوادەكەی كۆدەكردەوە یان چواردەورەكەی .

٨٧ - حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنِ الْحَكَمِ، عَنْ مُجَاهِدٍ، قِيلَ: قَالَ: «الرَّحْمَةُ تَنْزِلُ عِنْدَ خَتْمِ الْقُرْآنِ» .

٨٧ - مجاهد وتی : ڕەحمەت دادەبەزێ له كاتی خەتم كردنی قورئان.

٨٨ - حَدَّثَنَا الْهَيْثَمُ بْنُ أَيُّوبَ الطَّالْقَانِيُّ قَالَ: ثنا الْفُضَيْلُ بْنُ عِيَاضٍ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنِ الْحَكَمِ قَالَ: كَانَ مُجَاهِدٌ وَعَبْدَةُ بْنُ أَبِي لُبَابَةَ وَنَاسٌ يَعْرِضُونَ الْمَصَاحِفَ، فَلَمَّا كَانَ فِي الْيَوْمِ الَّذِي أَرَادُوا أَنْ يَخْتِمُوا فِيهِ الْقُرْآنَ بَعَثُوا إِلَيَّ، وَإِلَى سَلَمَةَ بْنِ كُهَيْلٍ .

فَقَالُوا: «إِنَّا كُنَّا نَعْرِضُ الْمَصَاحِفَ، وَإِنَّا نُرِيدُ أَنْ نَخْتِمَ الْيَوْمَ، فَإِنَّهُ كَانَ يُقَالُ: الرَّحْمَةُ تَنْزِلُ أَوْ تَحْضُرُ عِنْدَ خَتْمِ الْقُرْآنِ» .

٨٨ - الحكم وتی : ئیمامی مجاهد و عبدة كوڕی باوكی لبابة و خەڵكانێكی تر سەیری مصحەفەكانیان دەكرد [دەیانخوێندەوە والله

اعلم]، جا كاتێك ئەو ڕۆژە بهاتایە كە دەیانویست خەتمی قورئانی تێدا بكەن دەیاننارد بە دوای من و سلمة ی كوڕی كهیل .

جا دەیانوت : بەڕاستی ئێمە قورئانمان دەخوێندەوە وە ئێمە دەمانەوێ خەتمی بكەین ئەمڕۆ، چونكە بێگومان دەوترێ : ڕەحمەت دادەبەزێ یان ئامادە دەبێ لەكاتی خەتم كردنی قورئاندا) .

٨٩ - حَدَّثَنَا عُثْمَانُ بْنُ أَبِي شَيْبَةَ قَالَ: حَدَّثَنَا جَرِيرٌ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنِ الْحَكَمِ قَالَ: «كَانَ مُجَاهِدٌ وَعَبْدَةُ بْنُ أَبِي لُبَابَةَ عْرِضُونَ الْمَصَاحِفَ، وَلَمَّا كَانَ الْيَوْمُ الَّذِي أَرَادُوا أَنْ يَخْتِمُوا فِيهِ أَرْسَلُوا إِلَيَّ، وَإِلَى سَلَمَةَ» .

٨٩ - الحكم وتی : ئیمامی مجاهد و عبدة بن أبي لبابة سەیری مصحەفەكانیان دەكرد [دەیانخوێندەوە والله اعلم]، جا كاتێك ئەو ڕۆژە بهاتایە كە دەیانویست خەتمی قورئانی تێدا بكەن دەیاننارد بە دوای من و سلمة دا .

٩٠ - حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ مُعَاذٍ، ثنا أَبِي، ثنا شُعْبَةُ، عَنِ الْحَكَمِ قَالَ: أَرْسَلَ إِلَيَّ مُجَاهِدٌ .

فَقَالَ: إِنَّا دَعَوْنَاكَ، إِنَّا أَرَدْنَا أَنْ نَخْتِمَ الْقُرْآنَ، فَكَانَ يُقَالُ: «إِنَّ الدُّعَاءَ مُسْتَجَابٌ عِنْدَ خَتْمِ الْقُرْآنِ، ثُمَّ دَعَا بِدَعَوَاتٍ» .

٩٠ - الحكم دەڵێت : ئیمامی مجاهد رحمه الله ناردی بە دوامدا .

جـا وتى : ئێمه بـانگمـان كـردى، چونكـه دەمـانەوێ خەتمى قورئـان بكـەين، دەوترێ : بێگومان دوعا قەبوڵە لە كـاتى خەتم كـردنى قورئاندا پاشان دەستى كـرد بە دوعاكـردن .

**٩١** - حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ الْعَلَاءِ الزُّبَيْدِيُّ، ثنا بَقِيَّةُ، عَنْ شُـــعْبَةَ، عَنِ الْحَكَمِ بْنِ عُتَيْبَةَ قَالَ: بَعَثَ إِلَيَّ مُجَاهِدٌ وَعَبْدَةُ بْنُ أَبِي لُبَابَةَ فَأَتَيْتُهُمَا .

فَقَالَا: «هَلْ تَدْرِي لِمَ بَعَثْنَا إِلَيْكَ؟ إِنَّا أَرَدْنَا أَنْ نَخْتِمَ الْقُرْآنَ» .

**٩١** - حكـم ــى كـوڕى عتيبة دەڵێت : مجاهد و عبدة بن أبي لبابة ناردیان بە دوامدا جا هاتم بۆ لایان.

جـا وتيـان : ئـايـا دەزانى بۆچى نـاردمـان بە دواتـدا؟ ئێمە دەمـانەوێ خەتمى قـورئان بكـەين .

**٩٢** - حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى، ثنا مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ، ثنا شُـــعْبَةُ، عَنِ الْحَكَمِ قَالَ: بَعَثَ إِلَيَّ مُجَاهِدٌ، وَعَبْدَةُ بْنُ أَبِي لُبَابَةَ، فَذَكَرَ نَحْوَهُ .

**٩٢** - حـكـم دەڵێت : مجاهد و عبدة بن أبي لبابة ناردیان بە دوامدا جا بەهەمان شێوە باسيكـرد .

**٩٣** - حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، نا وَكِيعٌ، عَنْ مِسْـــعَرٍ قَالَ: سَـــمِعْتُ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ الْأَسْوَدِ يَقُولُ: يَذْكُرُ أَنَّهُ «إِذَا خَتَمَ الْقُرْآنَ يُصَلِّى عَلَيْهِ» .

**٩٣** - عبـد الرحمن كـورِى الأسـود دەڵێـت : دەوترێ كـاتێـك كەسێك خەتمی قورئان دەكات سەڵەواتی لەسەر لێدەدرێ .

---

**تێبینی : صـەڵەواتی فریشـتەكـان بۆ ئەوكەسـەی كە قورئان خەتم دەكات بە مانای دوعا كردن دێت بۆی بە چاكە والله اعلم .**

**٩٤** - حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْحَسَنِ، نا عَبْدُ اللَّهِ، أَخْبَرَنَا مِسْعَرٌ قَالَ: حَدَّثَنِي عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ الْأَسْوَدِ قَالَ: ذُكِرَ لِي: «أَنَّهُ يُصَلَّى عَلَيْهِ إِذَا خَتَمَ الْقُرْآنَ» .

**٩٤** - عبد الرحمن كورِى الأسـود وتی : بۆم باسـكراوە : كاتێك كەسێك خەتمی قورئان دەكات صەڵەواتی لەسەر لێدەدرێ .

**٩٥** - حَدَّثَنَا أَبُو جَعْفَرٍ النُّفَيْلِيُّ قَالَ: حَدَّثَنَا زُهَيْرُ بْنُ مُعَاوِيَةَ، ثنا إِسْحَاقُ، عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ، أَنَّ رَجُلًا كَانَ يَقْرَأُ سُورَةَ الْكَهْفِ، فَإِلَى جَنْبِهِ، أَوْ إِلَى جَانِبِهِ، شَكَّ زُهَيْرٌ، فَرَسٌ مَرْبُوطٌ بِشَطَنَيْنِ، فَغَشِيَتْهُ سَحَابَةٌ، فَجَعَلَتْ تَدْنُو وَتَدْنُو، وَجَعَلَ فَرَسُهُ يَنْفُرُ مِنْهَا، فَلَمَّا أَصْبَحَ ذَكَرَ ذَلِكَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ.

فَقَالَ: «تِلْكَ السَّكِينَةُ تَنَزَّلَتْ لِلْقُرْآنِ» .

**٩٥** - لە براء بن عازب رضـي الله عنه فەرمووی : پیاوێك سـورەتی (الكهف) ـی دەخوێندەوە و ئەسپەكەی لە لایەكی بەستبۆوە بە دوو

گوريس، جا پەڵە هەورێك هاتە خوارەوە و بەسەر پیاوەكەدا بڵاوبوویەوە، زیاتر و زیاتر نزیك دەبوویەوە لێیان، ئەسپەكەی دەستی كرد بە بازدان، جا كاتێك بەیانی كردەوە ئەمەی گێڕایەوە بۆ رسول الله ﷺ .

ئەویش فەرمووی : (ئەوە سەكینەت و ئارامی بوو دابەزی بەهۆی خوێندنەوەی قورئان) .

٩٦ - حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ قَالَ: نا اللَّيْثُ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ، أَنَّ رَجُلًا، مِنَ الْأَنْصَارِ يُقَالُ لَهُ: أُسَيْدُ بْنُ حُضَيْرٍ، كَانَ يَقْرَأُ عَلَى ظَهْرِ بَيْتِهِ، وَهُوَ حَسَنُ الصَّوْتِ، فَجَاءَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ .

فَقَالَ: "بَيْنَمَا أَنَا أَقْرَأُ إِذْ غَشِيَنِي شَيْءٌ كَالسَّحَابِ، وَالْمَرْأَةُ فِي الْبَيْتِ، وَالْفَرَسُ فِي الدَّارِ تَخَوَّفْتُ أَنْ تَسْقُطَ الْمَرْأَةُ، وَتَنْقَلِبَ الْفَرَسُ، فَانْصَرَفْتُ .

فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «اقْرَأْ أُسَيْدُ، فَإِنَّمَا هُوَ مَلَكٌ اسْتَمَعَ الْقُرْآنَ».

٩٦ - لە عبد الرحمن كوڕی كعب كوڕی مالك ـەوە كەوا پیاوێك لە پشتیوانان پێی دەوترا أُسید ـی كوڕی حضیر لە ماڵەكەی خۆیدا قورئانی دەخوێندەوە، وە ئەو دەنگی زۆر خۆش بوو، جا هاتە لای رسول الله ﷺ .

وتی : کاتێك قورئانم دەخوێندەوە شـتێك داپپۆشـیم وەکو پەڵە هەورێك، وە خێزانەکەم و ئەسپەکەم لە ماڵەوە بوو ترسام بکەوێتە سەر خێزانەکەم و ئەسپەکەم وەرگەڕێت بۆیە وازمهێنا لە خوێندنەوەی قورئان لەوکاتەدا .

جا رسـول الله ﷺ فەرمووی : (أَسـید بخوێنەوە چونکە بێگومان ئەوە فریشتە بوو گوێی گرتبوو بۆ خوێندنەوەی قورئان) .

## باب : (٦)

## (مَا رُوِيَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «لَا حَسَدَ إِلَّا فِي اثْنَتَيْنِ» : دەربارەی ئەوەی ڕیوایەتکراوە کەوا پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ : (حەسوودی نییە تەنها لە دوو شت نەبێت))

٩٧ - حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، ثنا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِيهِ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «لَا حَسَدَ إِلَّا فِي اثْنَتَيْنِ، رَجُلٌ آتَاهُ اللَّهُ الْقُرْآنَ، فَهُوَ يَقُومُ بِهِ آنَاءَ اللَّيْلِ وَآنَاءَ النَّهَارِ، وَرَجُلٌ آتَاهُ اللَّهُ مَالًا فَهُوَ يُنْفِقُهُ آنَاءَ اللَّيْلِ وَآنَاءَ النَّهَارِ» .

٩٧ - لە عبد اللهی کوڕی عمر رضـي الله عنهما، کەوا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (دروست نییە حەسوودی بردن بە کەسێك تەنها لە دوو شت نەبێت، پیاوێك کە الله عزَّ وَجَل زانستی جوان خوێندنەوەی قورئانی پێبەخشیوە، جا ئەویش دەیخوێنێتەوە لە نوێژەکانیدا لە کاتەکانی شەو و ڕۆژدا، وە پیاوێك کە الله عزَّ وَجَل ماڵ و سامانێکی زۆری پێبەخشیوە، جا ئەویش دەیبەخشێت لە پێناوی الله تعالى لە کاتەکانی شەو و ڕۆژدا) .

لەم حەدیسە کە باس لە سەروەت و سامان ئەکات، مەبەست لێی ئەوە نییە دایمە چاوت لەسەری بێت و ببێتە چاو و نەفەس بەسەریەوە، بەڵکو بەوەی کە ئەوکەسە بەو پارەیە ئەو پاداشتانە بەدەست دێنێت، بۆ نموونە بڵێ : یاالله چەندە حەزمەدەکرد هەمبێت بە ڕەحمەت ئاوا خێری پێ بکەم لەپێناو تۆ.

یان دوعای دەستکەوتنی بکەی، والله اعلم .

٩٨ - حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ الْمَدِينِيِّ، وَأَبُو بَكْرِ بْنُ أَبِي شَيْبَةَ قَالَا: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لَا حَسَدَ إِلَّا فِي اثْنَتَيْنِ، رَجُلٌ آتَاهُ اللَّهُ الْقُرْآنَ، فَهُوَ يَقُومُ بِهِ آنَاءَ اللَّيْلِ وَآنَاءَ النَّهَارِ، وَرَجُلٌ آتَاهُ اللَّهُ مَالًا فَهُوَ يُنْفِقُهُ آنَاءَ اللَّيْلِ وَآنَاءَ النَّهَارِ» .

٩٨ - لە عبد اللهی کوڕی عمر رضي الله عنهما، کەوا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (دروست نییە حەسوودی بردن بە کەسێك تەنها لە دوو شت نەبێت، پیاوێك کە الله عزَّ وَجَل زانستی جوان خوێندنەوەی قورئانی پێبەخشیوە، جا ئەویش دەیخوێنێتەوە لە نوێژەکانیدا لە کاتەکانی شەو و ڕۆژدا، وە پیاوێك کە الله عزَّ وَجَل ماڵ و سامانێکی زۆری پێبەخشیوە، جا ئەویش دەیبەخشێت لە پێناوی الله تعالی لە کاتەکانی شەو و ڕۆژدا) .

٩٩ - حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَزِيزٍ الْأَيْلِيُّ قَالَ: حَدَّثَنِي سَلَمَةُ بْنُ رَوْحٍ، عَنْ عَقِيلٍ قَالَ: قَالَ ابْنُ شِهَابٍ: وَأَخْبَرَنِي سَالِمُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: قَالَ عَبْدُ اللَّهِ

بْنُ عُمَرَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا حَسَدَ إِلَّا فِي اثْنَتَيْنِ، رَجُلٌ آتَاهُ اللَّهُ الْكِتَابَ فَقَامَ بِهِ آنَاءَ اللَّيْلِ وَآنَاءَ النَّهَارِ، وَرَجُلٌ أَعْطَاهُ اللَّهُ مَالًا فَتَصَدَّقَ بِهِ آنَاءَ اللَّيْلِ وَآنَاءَ النَّهَارِ» .

**٩٩** - هەمان حەدیسی (**٩٨**).

**١٠٠** - حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ سَيَّارٍ، حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ قَالَ: أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، حَدَّثَنِي سَالِمٌ، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «لَا حَسَدَ إِلَّا على اثْنَتَيْنِ، رَجُلٌ آتَاهُ اللَّهُ هَذَا الْكِتَابَ فَقَامَ بِهِ آنَاءَ اللَّيْلِ وَآنَاءَ النَّهَارِ، وَرَجُلٌ آتَاهُ اللَّهُ مَالًا، فَتَصَدَّقَ بِهِ آنَاءَ اللَّيْلِ وَآنَاءَ النَّهَارِ» .

**١٠٠** - هەمان حەدیس .

**١٠١** - حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ رَاهَوَيْهِ قَالَ: أَخْبَرَنَا جَرِيرٌ، عَنِ الْأَعْمَشِ قَالَ: نا عُثْمَانُ بْنُ أَبِي شَيْبَةَ، قَالَ: نا جَرِيرٌ، عَنِ الْأَعْمَشِ قَالَا جَمِيعًا: عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا حَسَدَ إِلَّا فِي اثْنَتَيْنِ، رَجُلٌ آتَاهُ اللَّهُ عز وجل الْقُرْآنَ فَهُوَ يَتْلُوهُ آنَاءَ اللَّيْلِ وَآنَاءَ النَّهَارِ .

فَيَقُولُ الرَّجُلُ: لَوْ أُتِيتُ مِثْلَ مَا أُوتِيَ هَذَا لَفَعَلْتُ كَمَا يَفْعَلُ .

وَرَجُلٌ آتَاهُ اللَّهُ مَالًا، فَهُوَ يُنْفِقُهُ فِي حَقِّهِ .

فَيَقُولُ الرَّجُلُ: لَوْ أُتِيتُ مِثْلَ مَا أُوتِي هَذَا لَفَعَلْتُ كَمَا يَفْعَلُ» .

**١٠١** - لە ئەبو هریرەوە رضـي الله عنـه فەرمووی، رســول الله ﷺ فەرمووی : (دروســت نییە ئاوات خواســتن بەوەی وەكـو كـەســێك بن جگە لە دوو كـەس نەبێت، پیاوێك الله عزَّ وَجَل قورئانی پێبەخشیوە، جا ئەویش دەیخوێنێتەوە لە نوێژەكـانیـدا لە كـاتەكـانی شــەودا وە لە كـاتەكـانی ڕۆژدا .

جـا پیـاوێـك دەڵێـت : خۆزگە منیش ئەوەم پێـدرابوایە وەكـو دراوە بەو، ئەوا ئەو كـارەم دەكـرد وەكـو ئەوەی ئەو دەیكـات .

وە پیاوێك الله عزَّ وَجَل ماڵ و ســامانێكـی زۆری پێبەخشــیوە، جا ئەویش سەرفی دەكـات لە حەقی خۆیدا **[لە بەخشین و چاكەدا]** .

جـا پیـاوێـك دەڵێـت : خۆزگە منیش ئەوەم پێـدرابوایە وەكـو دراوە بەو، ئەوا ئەو كـارەم دەكـرد وەكـو ئەوەی ئەو دەیكـات) .

**١٠٢** - حَدَّثَنَا عَبْدُ الْأَعْلَى بْنُ حَمَّادٍ، نا بِشْــرُ بْنُ مَنْصُــورٍ، عَنْ شُــعْبَةَ بْنِ الْحَجَّـاجِ، عَنِ الْأَعْمَشِ، عَنْ ذَكْوَانَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَـالَ: «لَا حَسَــدَ إِلَّا فِي اثْنَتَيْنِ: رَجُلٌ عَلَّمَهُ اللَّهُ الْقُرْآنَ فَهُوَ يَتْلُوهُ آنَاءَ اللَّيْلِ وَآنَـاءَ النَّهَارِ، فَسَــمِعَهُ جَارٌ لَهُ، فَقَالَ: لَوْ أُوتِيتُ مِثْلَ مَا أُوتِي هَذَا عَمِلْتُ فِيهِ مِثْلَ عَمَلِهِ، وَرَجُلٌ أَعْطَاهُ اللَّهُ مَالًا فَسَــلَّطَهُ عَلَيْهِ فَيُنْفِقُهُ فِي الْحَقِّ، فَقَالَ رَجُلٌ: لَوْ أُوتِيتُ مِثْلَ مَا أُوتِي هَذَا عَمِلْتُ فِيهِ مِثْلَ عَمَلِهِ» .

**١٠٢** - هەمان حەدیسی پێشوو .

**١٠٣** - حَدَّثَنَا أَبُو بَكْرِ بْنُ أَبِي شَيْبَةَ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ نُمَيْرٍ قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ أَبِي خَالِدٍ، عَنْ قَيْسِ بْنِ أَبِي حَازِمٍ، سَمِعْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ مَسْعُودٍ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا حَسَدَ إِلَّا فِي اثْنَتَيْنِ: رَجُلٌ آتَاهُ اللَّهُ مَالًا، فَسَلَّطَهُ عَلَى هَلَكَتِهِ فِي الْحَقِّ، وَرَجُلٌ آتَاهُ اللَّهُ الْحِكْمَةَ فَهُوَ يَقْضِي بِهَا وَيُعَلِّمُهَا» .

**١٠٣** - عبدالله ی كوڕی مسعود رضي الله عنه دەفەرمووێ: رسول الله ﷺ فەرمووی: (حەسوودی بردن نییە تەنها بە دوو كەس نەبێ پیاوێك الله تعالى ماڵ و سامانی پێبەخشیوە الله تعالى وای لێكردووە لە گوێڕایەڵی الله و لەحەقدا سەرفی بكات، وە پیاوێك الله عزَّ وَجَل حیكمەتی [قورئان] پێداوە جا ئەویش جێبەجێی دەكات وە خەڵكیش فێر دەكات) .

**١٠٤** - حَدَّثَنَا عُثْمَانُ بْنُ أَبِي شَيْبَةَ، ثنا جَرِيرُ بْنُ عَبْدِ الْحَمِيدِ، وَمُحَمَّدُ بْنُ بِشْرٍ، عَنْ إِسْمَاعِيلَ بْنِ أَبِي خَالِدٍ، عَنْ قَيْسِ بْنِ أَبِي حَازِمٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا حَسَدَ إِلَّا فِي اثْنَتَيْنِ: رَجُلٌ أَعْطَاهُ اللَّهُ مَالًا فَسَلَّطَهُ عَلَى هَلَكَتِهِ فِي الْحَقِّ، وَرَجُلٌ آتَاهُ اللَّهُ الْحِكْمَةَ، فَهُوَ يَقْضِي بِهَا، وَيُعَلِّمُهَا» .

**١٠٤** - هەمان حەدیسی پێشوو .

١٠٥ - حَدَّثَنَا أَبُو أَيُّوبَ سُلَيْمَانُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ الدِّمَشْقِيُّ قَالَ: حَدَّثَنَا عِيسَى بْنُ يُونُسَ قَالَ: حَدَّثَنَا الْأَعْمَشُ، عَنْ سَالِمِ بْنِ أَبِي الْجَعْدِ، عَنْ أَبِي كَبْشَةَ الْأَنْمَارِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: «إِنَّمَا مِثْلُ هَذِهِ الْأُمَّةِ أَرْبَعَةُ نَفَرٍ، رَجُلٌ آتَاهُ اللَّهُ مَالًا وَعِلْمًا فَهُوَ يَعْمَلُ فِي مَالِهِ بِعِلْمِهِ .

وَرَجُلٌ آتَاهُ اللَّهُ عِلْمًا وَلَمْ يُؤْتِهِ مَالًا، فَهُوَ يَقُولُ: لَيْتَ لِي مِثْلُ مَا أُوتِيَ فُلَانٌ فَأَعْمَلَ فِيهِ مِثْلَ عَمَلِهِ، فَهُمَا فِي الْأَجْرِ سَوَاءٌ .

وَرَجُلٌ آتَاهُ اللَّهُ مَالًا، وَلَمْ يُؤْتِهِ عِلْمًا، فَهُوَ يُنْفِقُهُ فِي غَيْرِ حَقِّهِ، فَيَمْنَعُهُ مِنْ حَقِّهِ .

وَرَجُلٌ لَمْ يُؤْتِهِ اللَّهُ مَالًا وَلَا عِلْمًا،فَهُوَ يَقُولُ: لَيْتَ لِي مِثْلَ مَا أُوتِيَ فُلَانٌ فَأَعْمَلَ فِيهِ مِثْلَ عَمَلِهِ، وَهُمَا فِي الْوِزْرِ سَوَاءٌ» .

١٠٥ - له أبي كبشة الأنماري فەرمووی هەواڵی پێداین رسول الله ﷺ فەرمووی : (بێگومان نمونەی ئەم ئوممەتە وەکو چوار کەسە پیاوێك الله عزَّ وَجَل ماڵ و سامان و زانستی پێداوە جا لە ماڵەکەی سەرف دەکات بە زانستەکەی [واتە زەکاتەکەی دەردەکات و خێری پێدەکات لە پێناوی الله تعالی] .

وە پیاوێك الله عزَّ وَجَل زانستی پێداوە بەڵام ماڵ و سامانی پێنەبەخشیوە، جا دەڵێت : خۆزگە هەم بووایە بە وێنەی ئەوەی دراوە بە فلان کەس جا بەو شێوەم تێیدا دەکرد کە ئەو دەیکات [واتە بە هەمان شێوەی ئەو خەرجم دەکرد] جا هەردووکیان لە پاداشتدا یەکسانن .

وه پیاوێك كه الله عزَّ وَجَل ماڵی پێبەخشیوه بەڵام زانستی پێنەبەخشیوه، جا خەرجی دەكات له جگه له حەقی خۆی و ڕێگریش دەكات له حەقەكەی [ڕێگری دەكات له زەكاتەكەی و نەفەقەكەی كه لەسەری واجبه له حەرامدا خەرجی دەكات] .

وه پیاوێكیش الله عزَّ وَجَل نه ماڵ و سامان نه زانستی پێنەداوه جا دەشڵێت : خۆزگه هەم بووایه به وێنەی ئەوەی دراوه به فلان كەس جا بەو شێوەم تێیدا دەكرد كه ئەو دەیكات [واته به هەمان شێوەی ئەو خەرجم دەكرد] جا هەردووكیان له تاواندا یەكسانن) .

**١٠٦** - حَدَّثَنَا عُثْمَانُ بْنُ أَبِي شَيْبَةَ، نا جَرِيرٌ، وَوَكِيعٌ، عَنِ الْأَعْمَشِ، عَنْ سَالِمِ بْنِ أَبِي الْجَعْدِ، عَنْ أَبِي كَبْشَةَ الْأَنْمَارِيِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّمَا مِثْلُ هَذِهِ الْأُمَّةِ كَمَثَلِ أَرْبَعَةِ نَفَرٍ؛ رَجُلٌ آتَاهُ اللَّهُ مَالًا وَعِلْمًا، فَهُوَ يَعْمَلُ بِعِلْمِهِ فِي مَالِهِ .

وَرَجُلٌ آتَاهُ اللَّهُ عِلْمًا، فَلَمْ يُؤْتِهِ مَالًا، فَهُوَ يَقُولُ: لَوْ كَانَ لِي مِثْلُ مَالِ فُلَانٍ لَعَمِلْتُ فِيهِ كَمَا يَعْمَلُ، فَهُمَا فِي الْأَجْرِ سَوَاءٌ .

وَرَجُلٌ آتَاهُ اللَّهُ مَالًا، وَلَمْ يُؤْتِهِ عِلْمًا، فَهُوَ يَخْبِطُ فِي مَالِهِ، وَيُنْفِقُهُ فِي غَيْرِ حَقِّهِ .

وَرَجُلٌ لَمْ يُؤْتِهِ اللَّهُ مَالًا، وَلَمْ يُؤْتِهِ عِلْمًا، فَهُوَ يَقُولُ: لَوْ كَانَ لِي مِثْلُ مَالِ فُلَانٍ، لَعَمِلْتُ فِيهِ كَمَا يَعْمَلُ، فَهُمَا فِي الْوِزْرِ سَوَاءٌ» .

١٠٦ - هەمان حەدیسی پێشوو .

١٠٧ - حَدَّثَنَا مَيْمُونُ بْنُ الْأَصْبَغِ النَّصِيبِيُّ قَالَ: ثنا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يُوسُفَ قَالَ: ثنا الْهَيْثَمُ بْنُ حُمَيْدٍ قَالَ: حَدَّثَنِي زَيْدُ بْنُ وَاقِدٍ، عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ مُوسَى، عَنْ كَثِيرِ بْنِ مُرَّةَ، عَنْ يَزِيدَ بْنِ الْأَخْنَسِ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَا تَنَافُسَ بَيْنَكُمْ إِلَّا فِي اثْنَتَيْنِ: رَجُلٌ آتَاهُ اللَّهُ عز وجل قُرْآنًا فَهُوَ يَقُومُ بِهِ بِاللَّيْلِ وَالنَّهَارِ وَيَتَّبِعُ مَا فِيهِ .

فَيَقُولُ رَجُلٌ: لَوْ أَنَّ اللَّهَ أَعْطَانِي مِثْلَ مَا أَعْطَى فُلَانًا فَأَقُومَ بِهِ كَمَا يَقُومُ بِهِ .

وَرَجُلٌ أَعْطَاهُ اللَّهُ مَالًا فَهُوَ يُنْفِقُهُ وَيَتَصَدَّقُ بِهِ .

فَيَقُولُ الرَّجُلُ: لَوْ أَنَّ اللَّهَ أَعْطَانِي كَمَا أَعْطَى فُلَانًا، فَأَتَصَدَّقَ بِهِ» .

فَقَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ؛ أَرَأَيْتُ النَّجْدَةَ تَكُونُ فِي الرَّجُلِ؟

قَالَ: «لَيْسَتْ هُمَا بِعَدْلِ أَنَّ الْكَلْبَ لَيَهْزَمِرُّ وَرَاءَ أَهْلِهِ» .

١٠٧ - لە یزید ــی کوڕی الأخنس کەوا رسول اللە ﷺ فەرمووی : (مونافەسە مەکەن لە نێوان یەکتریدا جگە لە دوو شت نەبێت پیاوێك اللە عزَّ وَجَل قورئانی پێبەخشیوە جا ئەویش هەڵدەستێت بە خوێندنەوەی [لە نوێژدا] بە شەو و بە ڕۆژ وە شوێنی ئەوە دەکەوێت کە تێیدایەتی .

جا پیاوێك دەڵێت : ئەگەر الله عزَّ وَجَل پێی ببەخشیبام وەكو چۆن بە خشـــیوەتی بە فلان كەس ئەوا پێی هەڵدەســتام وەكو چۆن ئەو كردوویەتی .

وە پیاوێك الله عزَّ وَجَل ماڵ و سامانی پێداوە جا ئەویش دەبەخشێت و خێر و صەدەقەی پێدەكات .

جا پیاوێك دەلێت ئەگەر الله عزَّ وَجَل پێی بدابووایەم وەكو چۆن داویەتی بە فلان كەس ئەوا خێر و صەدەقەم پێدەكرد) .

جا پیاوێك وتی : ئەی رســول الله ئەی كە ئازایەتی و بوێریم ببینی لە پیاوێكدا؟

فەرمووی : (ئەمە یەكســان نییە ســەگیش دەوەڕێت كە لەپشــت خاوەنەكەی ئەڕوات) .

---

**والله اعلم مەبەســتی ئەوەیە كە بەهێزی پێوەر نییە بۆ حەق، نموونەش بە سـەگێ دێنێتەوە كاتێ لەدوای خاوەنەكەی دەڕوات و دەنگی بەرز دەكات وەك ئەوەی لێی بترسن یان نیشانی بدات كە بەهێزە .**

١٠٨ - حَدَّثَنَا إِسْـحَاقُ بْنُ مُوسَـى قَالَ: حَدَّثَنَا مَعْنُ بْنُ عِيسَـى قَالَ: عُرِضَ عَلَى مَالِكِ بْنِ أَنَسٍ عَنْ يَحْيَى بْنِ سَــعِيدٍ، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ مَسْــعُودٍ قَالَ: «إِنَّكَ فِي زَمَانٍ قَلِيلٌ قُرَّاؤُهُ كَثِيرٌ فُقَهَاؤُهُ، تُحْفَظُ فِيهِ حُدُودُ الْقُرْآنِ،

وَيُضَـيَّعُ حُرُوفُهُ، قَلِيلٌ مَنْ يَسْـأَلُ، كَثِيرٌ مَنْ يُعْطِي، يُطِيلُونَ فِيهِ الصَّـلَاةَ، وَيُقْصِرُونَ فِيهِ الْخُطْبَةَ، يُبْدُونَ فِيهِ أَعْمَالَهُمْ قَبْلَ أَهْوَائِهِمْ.

وَسَـيَأْتِي عَلَى النَّاسِ زَمَانٌ كَثِيرٌ قُرَّاؤُهُ، قَلِيلٌ فُقَهَاؤُهُ، تُحْفَظُ فِيهِ حُرُوفُ الْقُرْآنِ، وَتُضَـيَّعُ حُدُودُهُ كَثِيرٌ مَنْ يَسْـأَلُ، قَلِيلٌ مَنْ يُعْطِي، يُطِيلُونَ الْخُطْبَةَ، وَيُقْصِرُونَ الصَّلَاةَ، وَيُبْدُونَ أَهْوَاءَهُمْ قَبْلَ أَعْمَالِهِمْ».

١٠٨ - عبد الله ـــى كوڕى مســعود رضــي الله عنه دەفەرمووێ: بەڕاستی تۆ لە سـەردەمێكدايت قورئان خوێنانی كەمن [ئەوانەی تەنها گرنگی دەدەن بە جوان خوێندنەوەی قورئان] فەقیهەكانی زۆرن [ئەوانەی بیر لە ماناكانی دەكەنەوە و پرسـیارلە تەفسـیری قورئان دەكەن بۆ ئەوەی لێی تێبگەن و كاری پێبكەن] تێیدا سـنوورەكانی قورئان دەپارێزێت [حەڵاڵ و حەرامەكانی] و پیتەكانی وندەكات، كەمێكی داوا دەكات و زۆرێكی دەبەخشێت [واتە كەمێكی دەپاڕێتەوە لە خەڵكی پێی ببەخشن و زۆرێكی دەبەخشێت والله اعلم] نوێژ درێژ دەكەنەوە تێیدا و ووتار كورت دەكەنەوە [لە نوێژی هەینی]، دەست دەكەن بە كارو كردەوەكانیان پێش هەواو ئارەزووەكانیان [واتە كاردەكەن بۆقیامەتیان پێش تێركردنی حەزو ئارەزووەكانیان والله اعلم].

بەڵام سـەردەمێك دێت بە سـەر خەڵكیدا قورئان خوێنانی زۆرن [ئەوانەی تەنها گرنگی دەدەن بە جوان خوێندنەوەی قورئان و لەبەركردنی وەكو ئەم سـەردەمەی خۆمان] و فەقیهەكانی كەمن [تێیناگەن و كاری پێناكەن]، پیتەكانی قورئان دەپارێزرێت بەڵام سـنوورەكانی دەشـكێنرێت، زۆرێكی داوا دەكات [ماڵ و سـامان] كەمێكی هەیە

دەبەخشــێــت، ووتــار درێژ دەكـەنەوە و نوێژ كـورت دەكـەنەوە، وە شوێن هەواو ئارەزوویان دەكەون پێش كـاروكردەوەیان بۆ ڕۆژی دوایی .

**١٠٩** - حَـدَّثَنَا مَيْمُونُ بْنُ الْأَصْــبَغِ، حَـدَّثَنَا ابْنُ أَبِي مَرْيَمَ، نـا نَـافِعُ بْنُ يَزِيدَ، أَخْبَرَنِي بَكْرُ بْنُ عَمْرٍو أَنَّهُ سَمِعَ مِشْرَحَ بْنَ هَاعَانَ يَقُولُ: سَمِعْتُ عُقْبَةَ يَقُولُ: قَـالَ رَسُــولُ اللَّهِ ﷺ: «سَـــيَخْرُجُ أَقْوَامٌ مِنْ أُمَّتِي يَشْــرَبُونَ الْقُرْآنَ كَشُرْبِهِمُ الْمَاءَ» .

**١٠٩** - عقبة رضـي الله عنه دەفەرمووێ : رســول الله ﷺ فەرمووی : (كـۆمەڵـێـك لە ئـوممەتەكەم دەردەچـن قـورئـان دەخـۆنەوە وەكـو خواردنەوەیان بۆ ئاو) .

## باب : (٧)

(الْوَقْفِ فِي قِرَاءَةِ الْقُرْآنِ، وَالْجَمْعِ فِي السُّوَرِ، وَكَيْفَ كَانَتْ قِرَاءَةُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَتَرْتِيلُهُ، وَفِي كَمْ يَقْرَأُ الْقُرْآنَ، وَالسُّنَّةُ فِي ذَلِكَ: **وەستان لەکاتی خوێندنەوەی قورئان و، کۆکردنەوەی سورەتەکان و، چۆنیەتی خوێندنەوەی رسول الله ﷺ و بەباشی خوێندنەوەی، وە لە چەنێکدا قورئان ئەخوێندرێتەوە، وە سوننەت تیایدا)**

**١١٠** - حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، وَيَزِيدُ بْنُ مَوْهَبٍ الرَّمْلِيُّ قَالَا: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ بْنُ سَعْدٍ، عَنِ ابْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ، عَنْ يَعْلَى بْنِ مَمْلَكٍ أَنَّهُ سَأَلَ أُمَّ سَلَمَةَ زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ، عَنْ قِرَاءَةِ النَّبِيِّ ﷺ .

فَقَالَتْ: «مَا لَكُمْ وَصَلَاتِهِ؟»

كَانَ يُصَلِّي، ثُمَّ يَنَامُ قَدْرَ مَا صَلَّى .

ثُمَّ يُصَلِّي قَدْرَ مَا نَامَ، ثُمَّ يَنَامُ قَدْرَ مَا صَلَّى، حَتَّى يُصْبِحَ .

ثُمَّ نَعَتَتْ قِرَاءَتَهُ، فَإِذَا هِيَ تَنْعَتُ قِرَاءَةً مُفَسَّرَةً حَرْفًا حَرْفًا .

١١٠ - له یعلی کوڕی مملکەوە کەوا پرسیاری کرد لە ئوم سلمە رضي الله عنها هاوسەری رسول الله ﷺ لەبارەی قورئان خوێندنەوەی رسول الله ﷺ و نوێژەکەی .

وتی : دەتوانی چی بکەی بەراورد بە نوێژەکەی؟

ئەو نوێژی دەکرد، پاشان دەخەوت بە ئەندازەی نوێژەکەی کە کردبووی .

پاشان نوێژی دەکرد بە ئەندازەی ئەوەی کە خەوتبوو، پاشان دەخەوت بە ئەندازەی نوێژەکەی کە کردبووی هەتاوەکو بەیانی دەکردەوە .

پاشان باسی قورئان خوێندنەوەکەی کرد، جا باسی قورئان خوێندەوەکەی کرد خوێندنەوەیەکی پاراو پیت بە پیت .

١١١ - حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ عَلِيٍّ، ثنا أَبُو عَاصِمٍ، ثنا ابْنُ جُرَيْجٍ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي مُلَيْكَةَ، أَنْ يَعْلَى بْنَ مَمْلَكٍ، أَخْبَرَهُ، أَنَّهُ سَأَلَ أُمَّ سَلَمَةَ، فَذَكَرَ نَحْوَهُ، وَلَمْ يَذْكُرْ فِيهِ صِفَةَ الْقِرَاءَةِ .

١١١ - لە یعلی کوڕی مملك کەوا پرسیاری کرد لە أم سلمة رضي الله عنها جا باسی کرد بەهەمان شێوە بەڵام تێیدا باسی شێوازی قورئان خوێندنەوەکەی نەکرد .

**١١٢** - حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، عَنْ مَالِكِ بْنِ أَنَسٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنِ السَّائِبِ بْنِ يَزِيدَ، عَنِ الْمُطَّلِبِ بْنِ أَبِي وَدَاعَةَ السَّهْمِيِّ، عَنْ حَفْصَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّهَا قَالَتْ: «مَا رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ صَلَّى فِي سُبْحَتِهِ قَاعِدًا قَطُّ، حَتَّى كَانَ قَبْلَ وَفَاتِهِ بِعَامٍ، فَكَانَ يُصَلِّي فِي سُبْحَتِهِ قَاعِدًا، وَكَانَ يَقْرَأُ فِي السُّورَةِ، فَيُرَتِّلُهَا، حَتَّى تَكُونَ أَطْوَلَ مِنْ أَطْوَلَ مِنْهَا».

**١١٢** - حفصة رضي الله عنها هاوسەری رسول الله ﷺ دەفەرمووێت : هەرگیز نەمبینیبوو پێغەمبەری خوا ﷺ لە نوێژە سوننەتەکاندا بە دانیشتنەوە نوێژ بکات، هەتاوەکو ساڵێك پێش مردنی جا نوێژە سوننەکانی دەکرد بە دانیشتنەوە و قورئانی دەخوێندەوە بە هێمنی و لەسەرخۆییەوە هەتاوەکو درێژتر و درێژتری دەکردەوە.

**١١٣** - حَدَّثَنَا عَبْدُ الْأَعْلَى، حَدَّثَنَا وُهَيْبُ بْنُ خَالِدٍ، حَدَّثَنَا مَالِكُ بْنُ أَنَسٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، بِإِسْنَادِهِ مِثْلَهُ سَوَاءٌ.

**١١٣** - لە زهري ـەوە بە هەمان شێوەی پێشوو.

**١١٤** - حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ مُصَفًّى، حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ حَرْبٍ، نا الزُّبَيْدِيُّ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنِ السَّائِبِ بْنِ يَزِيدَ بْنِ أُخْتِ نَمِرٍ، أَنَّ الْمُطَّلِبَ بْنَ أَبِي وَدَاعَةَ السَّهْمِيَّ، أَخْبَرَهُ أَنَّ حَفْصَةَ زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ قَالَتْ: «لَمْ أَرَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ صَلَّى قَاعِدًا فِي سُبْحَتِهِ، حَتَّى كَانَ قَبْلَ أَنْ يُتَوَفَّى بِعَامٍ وَاحِدٍ، فَرَأَيْتُهُ يُصَلِّي فِي سُبْحَتِهِ، وَهُوَ قَاعِدٌ يُرَتِّلُ السُّورَةَ، حَتَّى تَكُونَ أَطْوَلَ مِنْ أَطْوَلَ مِنْهَا».

**١١٤** - حفصة رضي الله عنها هاوسەری رسول الله ﷺ دەفەرمووێت : نەمبینی پێغەمبەری خوا ﷺ لە نوێژە سوننەتەکاندا بە دانیشتنەوە نوێژبکات، هەتاوەکو ساڵێك پێش مردنی جا نوێژە سوننەکانی دەکرد بە دانیشتنەوە و قورئانی دەخوێندەوە بە هێمنی و لەسەرخۆییەوە هەتاوەکو درێژتر و درێژتری دەکردەوە .

**١١٥** - حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ مُصَفًّى، ثنا عُثْمَانُ بْنُ سَعِيدٍ قَالَ: حَدَّثَنِي شُعَيْبُ بْنُ أَبِي حَمْزَةَ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنِ السَّائِبِ بْنِ يَزِيدَ، عَنِ الْمُطَّلِبِ بْنِ أَبِي وَدَاعَةَ، عَنْ حَفْصَةَ أَنَّهَا قَالَتْ: «كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي قَائِمًا فِي سُبْحَتِهِ حَتَّى كَانَ قَبْلَ أَنْ يُتَوَفَّى بِعَامٍ وَاحِدٍ أَوِ اثْنَيْنِ، فَرَأَيْتُهُ يُصَلِّي قَاعِدًا فِي سُبْحَتِهِ، وَيُرَتِّلُ السُّورَةَ، حَتَّى تَكُونَ أَطْوَلَ مِنْ أَطْوَلَ مِنْهَا» .

**١١٥** - حفصة رضي الله عنها فەرمووی : رسول الله ﷺ لە نوێژە سوننەتەکاندا بە هەستانەوە نوێژی دەکرد، هەتاوەکو ساڵێك پێش ئەوەی وەفات بکات جا نوێژە سوننەکانی دەکرد بە دانیشتنەوە و قورئانی دەخوێندەوە بە هێمنی و لەسەرخۆییەوە هەتاوەکو درێژتر و درێژتری دەکردەوە .

**١١٦** - حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، ثنا ابْنُ لَهِيعَةَ، عَنِ الْحَارِثِ بْنِ يَزِيدَ، عَنْ زِيَادِ بْنِ نُعَيْمٍ، عَنْ مُسْلِمِ بْنِ مِخْرَاقٍ، عَنْ عَائِشَةَ، رضي الله عنها قَالَتْ: ذُكِرَ لَهَا أَنَّ أُنَاسًا يَقْرَءُونَ الْقُرْآنَ فِي اللَّيْلَةِ مَرَّةً أَوْ مَرَّتَيْنِ .

فَقَالَتْ: «أُولَئِكَ قَرَءُوا وَلَمْ يَقْرَءُوا، كُنْتُ أَقُومُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ لَيْلَةَ التَّمَامِ، فَكَانَ يَقْرَأُ سُورَةَ الْبَقَرَةِ وَآلَ عِمْرَانَ وَالنِّسَاءَ، فَلَا يَمُرُّ بِآيَةٍ فِيهَا تَخْوِيفٌ إِلَّا دَعَا اللَّهَ وَاسْتَعَاذَهُ، وَلَا يَمُرُّ بِآيَةٍ فِيهَا اسْتِبْشَارٌ إِلَّا دَعَا اللَّهَ وَرَغِبَ إِلَيْهِ».

**١١٦ -** عائشة دايكی ئیمانداران رضي الله عنها دەفەرمووێ : بۆی باسکرا کەوا خەڵکانێك قورئان دەخوێننەوە لە شەوێکدا جارێك یان دوو جار .

فەرمووی : ئەوانە خوێندوویەتیانەوە بەڵام نەیانخوێندووەتەوە، هەڵدەستامەوە بۆ شەونوێژ لەگەڵ رسول الله ﷺ لە شەوی مانگی چواردەدا، جا سورەتی البقرة و آل عمران و النساء ی دەخوێندەوە تێنەدەپەڕی بەلای ئایەتێك کە ترساندنی تێدابووایە [باسی جهنم و سزای الله عزَّوَجَل] ئیللا لە الله تعالی دەپاڕایەوە و پەنای پێدەگرت، وە تێنەدەپەڕی بەلای ئایەتێك کە موژدەدانی تێدا بووایە [بەهەشت] ئیللا لە الله تعالی دەپاڕایەوە کە پێی ببەخشێت .

**١١٧ -** حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ حَمَّادٍ قَالَ: ثنا وَهْبُ بْنُ جَرِيرٍ قَالَ: ثنا أَبِي قَالَ: سَمِعْتُ يَحْيَى بْنَ أَيُّوبَ،... يُحَدِّثُ عَنِ الْحَارِثِ بْنِ يَزِيدَ، عَنْ زِيَادِ بْنِ نُعَيْمٍ الْحَضْرَمِيِّ، عَنْ مُسْلِمِ بْنِ مِخْرَاقٍ قَالَ: قُلْتُ لِعَائِشَةَ رضي الله عنها: إِنَّ رِجَالًا يَقْرَأُ أَحَدُهُمُ الْقُرْآنَ فِي لَيْلَةٍ مَرَّتَيْنِ، أَوْ ثَلَاثًا .

فَقَالَتْ: «أُولَئِكَ قَرَءُوا، وَلَمْ يَقْرَءُوا، كُنْتُ أَقُومُ مَعَ رَسُـولِ اللَّهِ ﷺ فِي لَيْلَـةِ التَّمَـامِ، فَيَقْرَأُ بِـالْبَقَرَةِ، وَآلِ عِمْرَانَ، وَالنِّسَـــاءِ، فَلَا يَمُرُّ بِـآيَـةٍ فِيهَـا اسْتِبْشَارٌ إِلَّا دَعَا وَرَغِبَ، وَلَا يَمُرُّ بِآيَةٍ فِيهَا تَخْوِيفٌ إِلَّا دَعَا وَاسْتَعَاذَ».

**١١٧** - مسـلم ــي كوڕى مخراق دەڵێت: وتم بە عائشـة دايكى ئيمانداران رضـي الله عنها كەوا خەڵكانێك قورئان دەخوێننەوە لە شەوێكدا دوو جار يان سێ جار.

فەرمووى: (ئەوانە خوێندوويەتيانەوە بەڵام نەيانخوێندووەتەوە، هەڵدەستامەوە بۆ شـەونوێژ لەگەڵ رسـول الله ﷺ لە شـەوى مانگى چواردەدا جا سـورەتى البقرة و آل عمران و النسـاء دەخوێندەوە، تێنەدەپەڕى بەلاى ئايەتێك كە موژدەدانى تێدا بووايە [بەهەشـت] ئيللا لە الله تعالى دەپاڕايەوە كە پێى ببەخشێت، وە تێنەدەپەڕى بەلاى ئايەتێك كە ترسـاندنى تێدابووايە [باسـى جهنم و سـزاى الله عزَّوَجَل] ئيللا لە الله تعالى دەپاڕايەوە و پەناى پێدەگرت.

**١١٨** - حَدَّثَنَا أَبُو بَكْرِ بْنُ أَبِي شَـيْبَةَ، حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ نُمَيْرٍ، وَأَبُو مُعَاوِيَةَ، عَنِ الْأَعْمَشِ، عَنْ سَعْدِ بْنِ عُبَيْدَةَ، عَنِ الْمُسْتَوْرِدِ بْنِ الْأَحْنَفِ، عَنْ صِلَةَ بْنِ زُفَرَ، عَنْ حُذَيْفَةَ قَالَ: «صَلَّيْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَافْتَتَحَ الْبَقَرَةَ، فَقُلْتُ: يَرْكَعُ عِنْدَ الْمِائَةِ.

قَالَ: فَمَضَى.

فَقُلْتُ: يُصَلِّي بِهَا.

ثُمَّ افْتَتَحَ النِّسَاءَ، فَقَرَأَهَا، ثُمَّ افْتَتَحَ آلَ عِمْرَانَ، فَقَرَأَهَا مُتَرَسِّلًا، إِذَا مَرَّ بِآيَةٍ فِيهَا تَسْبِيحٌ سَبَّحَ، وَإِذَا مَرَّ بِآيَةٍ فِيهَا سُؤَالٌ يَسْأَلُ، وَإِذَا مَرَّ بِتَعْوِيذٍ تَعَوَّذَ .

ثُمَّ رَكَعَ قَالَ: (سُبْحَانَ رَبِّيَ الْعَظِيمِ)، فَكَانَ رُكُوعُهُ نَحْوًا مِنْ قِيَامِهِ .

ثُمَّ قَالَ: (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ)، ثُمَّ قَامَ طَوِيلًا قَرِيبًا مِمَّا رَكَعَ .

ثُمَّ سَجَدَ، فَقَالَ: (سُبْحَانَ رَبِّيَ الْأَعْلَى)، فَكَانَ سُجُودُهُ قَرِيبًا مِنْ قِيَامِهِ».

١١٨ - له حذيفة ـــەوە رضـي اللّه عنه فەرمووی : شـەونوێژم كـرد لەگەڵ رسول الله ﷺ جا دەستی كـرد بە خوێندنی سورەتی البقرة لە دڵە خۆمدا وتم لە ئايەتی سەد دەچێتە ڕكوع، وتی : بەڵام بەردەوام بوو .

وتم : تەواوی دەكات و دەچێتە ڕكوع .

پاشـان دەسـتی كـرد بە سـورەتی النسـاء و خوێندیەوە بەتەواوی پاشـان دەسـتی كـرد بە سـورەتی آل عمران و خوێندیەوە بەتەواوی، خوێندنەوەیەك بە هێمنی و لەسـەرخۆیی، كـاتێك تێبپەڕیایە بە ئایەتێك تەسبیحاتی تێدا بووایە سبحان اللّه ـی دەكرد، وە تێبپەڕیایە بە ئایەتێك داواكردنی تێدا بووایە داوای دەكرد لە اللّه تعالى، وە ئەگەر پەناگرتن بووایە پەنای دەگرت بە اللّه .

پـاشـان چووە ڕكـوع و فەرمووی : (سـبحـان ربي الـعظيم)، ڕكوعەكەی نزیك لە درێژی وەستانەكەی بوو .

پاشان فەرمووی : (سمع الله لمن حمده)، پاشان وەستانێکی درێژ وەستا نزيك لە ڕکوعەکەی .

پاشان سوجدەی برد و فەرمووی : (سبحان ربي الأعلى)، جا سوجدە بردنەکەی نزيك بوو لە درێژی وەستانەکەی .

**١١٩** - حَدَّثَنَا عُثْمَانُ بْنُ أَبِي شَيْبَةَ، وَعَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ الْمَدِينِيُّ قَالَا: حَدَّثَنَا جَرِيرُ بْنُ عَبْدِ الْحَمِيدِ، عَنِ الْأَعْمَشِ، عَنْ سَعْدِ بْنِ عُبَيْدَةَ، عَنِ الْمُسْتَوْرِدِ بْنِ الْأَحْنَفِ، عَنْ صِلَةَ بْنِ زُفَرٍ، عَنْ حُذَيْفَةَ قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَذَكَرَ نَحْوَهُ .

**١١٩** - لە حذيفة ـەوە رضي الله عنه فەرمووی : شەونوێژم کرد لەگەڵ رسول الله ﷺ جا بە هەمان شێوە باسی کرد .

**١٢٠** - حَدَّثَنَا أَبُو بَكْرِ بْنُ أَبِي شَيْبَةَ، نا مُصْعَبُ بْنُ الْمِقْدَامِ، عَنْ زَائِدَةَ، عَنْ عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ عُمَيْرٍ قَالَ: حَدَّثَنِي ابْنُ أَخِي حُذَيْفَةَ، عَنْ حُذَيْفَةَ قَالَ: «أَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ ذَاتَ لَيْلَةٍ لِأُصَلِّيَ بِصَلَاتِهِ، فَافْتَتَحَ الصَّلَاةَ، فَقَرَأَ قِرَاءَةً لَيْسَتْ بِالْخَفِيضَةِ، وَلَا بِالرَّفِيعَةِ، قِرَاءَةً يُرَتِّلُ فِيهَا يُسْمِعُنَا .

قَالَ: ثُمَّ رَكَعَ نَحْوًا مِنْ سُورَةٍ .

ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ، وَقَالَ: (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ ذَا الْمَلَكُوتِ وَذَا الْجَبَرُوتِ وَالْكِبْرِيَاءِ وَالْعَظَمَةِ) .

قَالَ: ثُمَّ قَامَ نَحْوًا مِنْ سُورَةٍ .

قَالَ: وَسَجَدَ نَحْوًا مِنْ ذَلِكَ، حَتَّى فَرَغَ مِنَ الطِّوَالِ، وَعَلَيْهِ سَوَادٌ مِنَ اللَّيْلِ» .

قَالَ عَبْدُ الْمَلِكِ: وَهُوَ تَطَوَّعُ اللَّيْلِ .

**١٢٠** - له حذيفة ـەوە رضي الله عنه فەرمووى : شەوێکیان هاتم بۆ لای رسول الله ﷺ بۆ ئەوەی شەو نوێژی لەگەڵ بکەم، جا نوێژی دەست پێکرد و قورئانی خوێندەوە بە دەنگێکی نە زۆر نزم نە زۆر بەرز بە خوێندنەوەیەکی زۆر جوان کە دەمانبیست .

وتی : پاشان چووە ڕکوع مایەوە تێیدا بە ئەندازەی خوێندنی سورەتێك .

پاشان سەری بەرز کردەوە و فەرمووی (سمع الله لمن حمده ذا الملكوت و ذا الجبروت والكبرياء والعظمة) .

حذيفة دەڵێت : پاشان ڕاوەستا بە ئەندازەی خوێندنی سورەتێك .

وتی : وە سوجدەی برد بەهەمان شێوە هەتاوەکو تەواو بوو لە سورەتە درێژەکان و شەوی تاریکی بەسەرداهات) .

عبد الملك دەڵێت ئەوە شەونوێژ بوو .

**١٢١** - حَدَّثَنَا مَيْمُونُ بْنُ الْأَصْبَغِ، نا أَبُو صَالِحٍ، ثنا مُعَاوِيَةُ بْنُ صَالِحٍ، عَنْ عَمْرِو بْنِ قَيْسٍ الْكِنْدِيِّ أَنَّهُ سَمِعَ عَاصِمَ بْنَ حُمَيْدٍ يَقُولُ: سَمِعْتُ عَوْفَ بْنَ مَالِكٍ يَقُولُ: «كُنْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَبَدَأَ فَاسْتَاكَ.

ثُمَّ تَوَضَّأَ.

ثُمَّ قَامَ يُصَلِّي، فَقُمْتُ مَعَهُ، فَبَدَأَ فَاسْتَفْتَحَ مِنَ الْبَقَرَةِ، لَا يَمُرُّ بِآيَةِ رَحْمَةٍ إِلَّا وَقَفَ عِنْدَهَا فَسَأَلَ، وَلَا يَمُرُّ بِآيَةِ عَذَابٍ إِلَّا وَقَفَ فَتَعَوَّذَ.

ثُمَّ رَكَعَ،فَمَكَثَ رَاكِعًا قَدْرَ قِيَامِهِ يَقُولُ فِي رُكُوعِهِ: «سُبْحَانَ ذِي الْمَلَكُوتِ وَالْجَبَرُوتِ وَالْكِبْرِيَاءِ وَالْعَظَمَةِ».

ثُمَّ سَجَدَ بِقَدْرِ رُكُوعِهِ، فَيَقُولُ: «سُبْحَانَ ذِي الْجَبَرُوتِ وَالْمَلَكُوتِ وَالْكِبْرِيَاءِ وَالْعَظَمَةِ».

ثُمَّ قَرَأَ آلَ عِمْرَانَ، ثُمَّ سُورَةً سُورَةً يَفْعَلُ مِثْلَ ذَلِكَ».

**١٢١** - عەوف ـى كوڕى مالك رضي الله عنه دەفەرمویٚ: لەگەڵ رسول الله ﷺ بووم دەستی كرد بە سیواك كردن.

پاشان دەست نوێژی گرت.

پاشان هەستا نوێژ بكات منیش هەستام لەگەڵی جا دەستی كرد بە خوێندنەوەی سورەتی البقرة تێنەدەپەڕی بە ئایەتێك ڕەحمەتی تێدابوایە ئیللا ڕادەوستا و داوای دەكرد وە تێنەدەپەڕی بە ئایەتی سزا ئیلا دەوەستا و پەنای دەگرت بە الله.

پاشــان ڕكـوعى برد لە ڕكـوع مايەوە بە ئەندازەى وەســتانەكـەى، لە ڕكـوعەكـەيـدا دەيفەرموو : ســبـحـان ذي الملكـوت و الجـبروت والكبرياء والعظمة .

پاشــــان ســــوجدەى برد بە ئەنـدازەى ڕكـوعەكـەى دەيفەرموو : سبحان ذي الجبروت و الملكوت والكبرياء والعظمة .

پاشـان آل عمران ـــى خوێندەوە، پاشـان سـوڕەتێكى تر بە هەمان شێوەى دەكـرد) .

**١٢٢** - حَدَّثَنَا عُثْمَانُ بْنُ أَبِي شَـيْبَةَ، نا يَحْيَى بْنُ آدَمَ، نا زُهَيْرٌ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنِ الْأَسْـوَدِ بْنِ يَزِيدَ، وَعَلْقَمَةَ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ، أَنَّ رَجُلًا أَتَاهُ، فَقَالَ: "قَرَأْتُ الْمُفَصَّلَ فِي رَكْعَةٍ .

فَقَالَ: «هَذًّا كَهَذِّ الشِّـعْرِ، وَنَثْرًا كَنَثْرِ الدَّقَلِ، لَكِنَّ رَسُـولَ اللَّهِ ﷺ لَمْ يَفْعَلْ كَمَا فَعَلْتَ، كَانَ يَقْرَأُ بِالنَّظَائِرِ الرَّحْمَنِ وَالنَّجْمِ فِي رَكْعَةٍ» .

**١٢٢** - پياوێك هاتە لاى عبد اللهى كـوڕى مسـعود جا وتى : سـوڕەتە موفەصەلەكـانم خوێندەوە لە يەك ڕكـاعەتدا .

عـبـد اللهى كـوڕى مســـعـود وتى : ئەوە زۆر بە خـێرايى و بەبێ وردبوونەوە خوێنـدووتە، بەڵام رسـول الله ﷺ ئەوەى نەكـردووە كـە كـردووتە، هـاوشـــێـوەى الـرحـمـن و والـنـجـمى دەخـوێـنـدەوە لە يەك ڕكـاعەتدا) .

١٢٣ - حَـدَّثَنَـا مُحَمَّـدُ بْنُ الْعَلَاءِ، نـا يَحْيَى بْنُ آدَمَ، نـا زُهَيْرٌ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ عَلْقَمَةَ، وَالْأَسْوَدِ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ، فَذَكَرَ نَحْوَهُ .

١٢٣ - هەمان ئەثەری پێشوو .

١٢٤ - حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ، نا يَحْيَى بْنُ آدَمَ، عَنْ إِسْــرَائِيلَ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنِ الْأَسْوَدِ، وَعَلْقَمَةَ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: أَتَاهُ رَجُلٌ، فَقَالَ: إِنِّي أَقْرَأُ الْمُفَصَّلَ فِي رَكْعَةٍ .

فَقَالَ: «هَذًّا كَهَذِّ الشِّعْرِ، وَنَثْرًا كَنَثْرِ الدَّقَلِ، وَلَكِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَقْرَأُ النَّظَائِرَ فِي كُلِّ رَكْعَةٍ. . . الرَّحْمَنَ وَالنَّجْمَ فِي رَكْعَةٍ .

وَالطُّورَ وَالذَّارِيَاتِ فِي رَكْعَةٍ .

وَيَا أَيُّهَا الْمُزَّمِّلُ، وَيَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ فِي رَكْعَةٍ .

وَوَيْلٌ لِلْمُطَفِّفِينَ، وَعَبَسَ فِي رَكْعَةٍ .

وَهَلْ أَتَى عَلَى الْإِنْسَانِ وَلَا أُقْسِمُ بِيَوْمِ الْقِيَامَةِ فِي رَكْعَةٍ .

وَعَمَّ يَتَسَاءَلُونَ، وَالْمُرْسَلَاتِ فِي رَكْعَةٍ .

وَالدُّخَانَ، وَإِذَا الشَّمْسُ كُوِّرَتْ فِي رَكْعَةٍ» .

١٢٤ - لە عبد اللهی کوڕی مسـعودەوە رضي الله عنه وتی : پیاوێك هاتە لای وتی : بەڕاسـتی من سـوڕەتە موفەصـەلەکان دەخوێنمەوە لە یەك ڕکاعەتدا .

عبد اللّەی كوڕی مسعود وتی : ئەوە زۆر بە خێرایی خوێندووتە ئەمەش وەك شیعر و پەخشان، پەخشانێکی الدقل **[مەبەستی ئەوەیە ئەوکەسەی کە بەخێرایی و بێ وردبوونەوە قورئان دەخوێنێتەوە وەکو کەسێك وایە کە شیعر و نوسراو دەخوێنێتەوە بۆ ئەوەی ورد بێتەوە لێی، وە نموونە دێنێتەوە بە الدقل کە خراپترین جۆری خورمایە، واللە اعلم]**، بەڵام رسول اللە ﷺ نظائرەکانی دەخوێندەوە لە یەك ڕکعاتدا .

الرحمن والنجم لە یەك ڕکاعەتدا .

والطور والذاريات لە یەك ڕکاعەتدا .

و يا أيها المزمل و يا أيها المدثر لە یەك ڕکاعەتدا .

و ويل للمطففين و عبس لە یەك ڕکاعەتدا .

و هل أتى على الإنسان و لا أقسم بيوم القيامة لە یەك ڕکاعەتدا .

وعم يتسائلون و المرسلات لە یەك ڕکاعەتدا .

و الدخان و إِذَا الشَّمْسُ كُوِّرَتْ لە یەك ڕکاعەتدا .

**١٢٥** - حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْعَلَاءِ قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ قَيْسٍ، عَنْ أَبِي حُصَيْنٍ، عَنْ يَحْيَى بْنِ وَثَّابٍ، عَنْ مَسْرُوقٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: «لَقَدْ حَفِظْتُ النَّظَائِرَ الَّتِي كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَقْرَأُ بِهِنَّ سُورَتَيْنِ فِي كُلِّ رَكْعَةٍ. . .

الرَّحْمَنَ وَالنَّجْمَ فِي رَكْعَةٍ .

وَالذَّارِيَاتِ وَالطُّورَ فِي رَكْعَةٍ .

وَاقْتَرَبَتْ وَالْحَاقَّةَ فِي رَكْعَةٍ .

وَالْمُزَّمِّلَ وَالْمُدَّثِّرَ فِي رَكْعَةٍ .

وَوَيْلٌ لِلْمُطَفِّفِينَ وَعَبَسَ فِي رَكْعَةٍ .

وَهَلْ أَتَى عَلَى الْإِنْسَانِ وَلَا أُقْسِمُ بِيَوْمِ الْقِيَامَةِ فِي رَكْعَةٍ .

وَالْمُرْسَلَاتِ وَعَمَّ يَتَسَاءَلُونَ فِي رَكْعَةٍ .

وَإِذَا الشَّمْسُ كُوِّرَتْ، وَالدُّخَانَ فِي رَكْعَةٍ» .

**١٢٥** - له عبد اللهى كورِى مسعودەوە رضي الله عنه وتى : بێگومان ئەو سورِەتە نظائرانەم لەبەر كردووە كەوا رسول الله دوو سورِەت دوو سورِەت دەیخوێندەوە لە یەك رِكعاتدا .

الرحمن والنجم لە یەك رِكاعەتدا .

والذاريات والطور لە یەك رِكاعەتدا .

اقتربت والحاقة لە یەك رِكاعەتدا .

والمزمل والمدثر لە یەك رِكاعەتدا .

و ويل للمطففين و عبس لە یەك رِكاعەتدا .

و هل أتى على الإنسان و لا أقسم بيوم القيامة لە یەك رِكاعەتدا .

والمرسلات وعم يتسائلون لە یەك رِكاعەتدا .

و إذا الشمس كورت والدخان لە یەك رِكاعەتدا .

١٢٦ - حَدَّثَنَا عُثْمَانُ بْنُ أَبِي شَيْبَةَ قَالَ: حَدَّثَنَا غُنْدَرٌ، عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ عَمْرِو بْنِ مُرَّةَ، أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا وَائِلٍ، يُحَدِّثُ: زَعَمَ أَنَّ رَجُلًا جَاءَ إِلَى عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ فَقَالَ: إِنِّي قَرَأْتُ الْمُفَصَّلَ اللَّيْلَةَ كُلَّهُ فِي رَكْعَةٍ .

فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ: «هَذًّا كَهَذِّ الشِّعْرِ .

قَالَ عَبْدُ اللَّهِ: لَقَدْ عَرَفْتُ النَّظَائِرَ الَّتِي كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُقْرِنُ بَيْنَهُنَّ.

قَالَ: فَذَكَرَ عِشْرِينَ سُورَةً مِنَ الْمُفَصَّلِ سُورَتَيْنِ، سُورَتَيْنِ فِي رَكْعَةٍ» .

١٢٦ - پیاوێك هاته لای عبد اللّەی كوڕی مسعود جا وتی : بەڕاستی من ئەمشەو سوڕەتە موفەصەلەكانم - و اته سورەته زۆرەكان - خوێندەوە لە یەك ڕكاعەتدا .

عبد اللّەی كوڕی مسعود وتی : ئەوە وەكو بەخێرایی خوێندنەوەی شیعرە .

عبداللە وتی : بێگومان ئەو سوڕەتە نظائرانەم لەبەر كردووە كەوا رسول اللە ﷺ پێكەوە دەیخوێندەوە .

وتی : جا باسی بیست سوڕەتی كرد لە مفصلەكان دوو سوڕەت دوو سوڕەت لە یەك ڕكاعەتدا .

١٢٧ - حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ خَالِدِ بْنِ مَوْهَبٍ الرَّمْلِيُّ، حَدَّثَنَا الْمُفَضَّلُ بْنُ فَضَالَةَ، عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ، عَنِ ابْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ، عَنْ يَحْيَى بْنِ حَكِيمِ بْنِ

صَـــفْوَانَ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ قَالَ: «جَمَعْتُ الْقُرْآنَ، فَقَرَأْتُ بِهِ فِي كُلِّ لَيْلَةٍ، فَبَلَغَ ذَلِكَ النَّبِيَّ ﷺ .

فَقَالَ: «اقْرَأْهُ فِي كُلِّ شَهْرٍ» .

قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ؛ دَعْنِي أَسْتَمْتِعْ مِنْ قُوَّتِي وَشَبَابِي .

قَالَ: «اقْرَأْهُ فِي كُلِّ عَشْرٍ» .

قَالَ: فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ؛ دَعْنِي أَسْتَمْتِعْ مِنْ قُوَّتِي وَشَبَابِي .

قَالَ: «اقْرَأْهُ فِي كُلِّ عَشْرٍ» .

قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ؛ دَعْنِي أَسْتَمْتِعْ مِنْ قُوَّتِي وَشَبَابِي، فَأَبَى» .

**١٢٧** - عبد الله ـــی کـوڕی عمرو ـــی کـوڕی عـاص رضي الله عنهما دەفەرمووێ : قورئانم هەموو لەبەر کرد، جا هەموو شەوێك خەتمێکم دەکرد، ئەمە گەیشتەوە بە پێغەمبەر ﷺ .

جـا فـەرمووی : (بیخوێنەوە لە هەموو مـانگێکـدا **[واتە مـانگێ یەك خەتم بکە والله اعلم]** ) .

وتی : وتم : ئەی رسـول الله ﷺ ڕێگەم پێبدە سـوود وەربگرم لە هێز و توانا و گەنجیەتیم .

فەرمووی : (بیخوێنەوە لە دە ڕۆژدا) .

وتی : وتم : ئەی رسـول الله ﷺ ڕێگەم پێبدە سـوود وەربگرم لە هێز و توانا و گەنجیەتیم .

فەرمووی : (بیخوێنەوە لە دە ڕۆژا) .

وتی : وتم : ئەی رسول الله ڕێگەم پێبدە سوود وەربگرم لە هێز و توانا و گەنجیەتیم جا نکۆڵی کرد .

**١٢٨** - حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ لَهِيعَةَ، عَنْ حِبَّانَ بْنِ وَاسِعٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ سَعْدِ بْنِ الْمُنْذِرِ الْأَنْصَارِيِّ، أَنَّهُ قَالَ: "يَا رَسُولَ اللَّهِ أَقْرَأُ الْقُرْآنَ فِي ثَلَاثٍ؟

قَالَ: «نَعَمْ، إِنِ اسْتَطَعْتَ» .

قَالَ: فَكَانَ يَقْرَأُ كَذَلِكَ، حَتَّى تُوُفِّيَ .

**١٢٨** - لە سعیدی کوڕی المنذر الأنصاري کەوا فەرمووی : ئەی رسول الله ئایا قورئان خەتم بکەم لە سێ ڕۆژدا؟

فەرمووی : (بەڵێ ئەگەر لە تواناتدا بوو) .

دەڵێت : جا بەو شێوە دەیخوێندەوە هەتا وەفاتی کرد .

**١٢٩** - حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، عَنْ مَالِكِ بْنِ أَنَسٍ، عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ، أَنَّهُ قَالَ: كُنْتُ أَنَا وَمُحَمَّدُ بْنُ يَحْيَى بْنِ حُبَابٍ، جَالِسَيْنِ، فَدَعَا رَجُلًا فَقَالَ: أَخْبِرْنِي بِالَّذِي سَمِعْتَ مِنَ أَبِيكَ؟

فَقَالَ الرَّجُلُ: أَخْبَرَنِي أَبِي: أَنَّهُ أَتَى زَيْدَ بْنَ ثَابِتٍ فَقَالَ لَهُ: كَيْفَ تَرَى قِرَاءَةَ الْقُرْآنِ فِي سَبْعٍ؟

فَقَالَ زَيْدٌ: حَسَنٌ، وَلَئِنْ أَقْرَأَهُ فِي نِصْفِ شَهْرٍ أَوْ عِشْرِينَ أَحَبُّ إِلَيَّ، وَسَلْنِي لِمَ ذَاكَ؟

فَقَالَ: فَإِنِّي أَسْأَلُكَ؟

قَالَ زَيْدٌ: لِكَيْ أَتَدَبَّرَهُ، وَأَقِفَ عَلَيْهِ .

**١٢٩** - يحيى كوڕى سعيد دەڵێت : من و محمدى كوڕى يحيى كوڕى حباب دانيشتبووين جا بانگى كەسێكى كرد و وتى : هەواڵم بدەرێ بەوەى بيستووتە لەباوكتەوە؟

پياوەكە وتى : باوكم هەواڵى پێدام كەوا چووە لاى زيدى كوڕى ثابت رضي الله عنه .

پێى وت : چۆن دەبينى خەتم كردنى قورئان لە حەوت ڕۆژدا؟

زەيد وتى : چاكە بەڵام ئەگەر بە نيو مانگ يان بيست ڕۆژ خەتمێك بكەم پێم خۆشترە، پرسيارم لێبكە بۆچى؟

باوكم وتى : دەى من پرسيارت لێدەكەم بۆچى؟

زەيد وتى : بۆ ئەوەى تەدەبور بكەم و لەسەرى بوەستم **[بيرى لێبكەمەوە و لێى تێبگەم]** .

١٣٠ - حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ مُعَاذٍ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبِي قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ سُلَيْمَانَ عَنْ عُمَارَةَ بْنِ عُمَيْرٍ، عَنْ أَبِي الْأَحْوَصِ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: «اقْرَءُوا الْقُرْآنَ فِي كُلِّ سَبْعٍ، وَلْيُحَافِظْ أَحَدُكُمْ عَلَى حِزْبِهِ فِي يَوْمِهِ وَلَيْلَتِهِ» .

١٣٠ - عبد الله ی كوڕی مسعود رضي الله عنه دەفەرموێ : قورئان بخوێننەوە خەتم بکەن لە هەموو حەفتەیەکدا، وە با هەر یەکێکتان پارێزگاری بکات لە حزبەکەی لە شەو و ڕۆژێکدا .

١٣١ - حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ الْأَعْلَى، نا خَالِدُ بْنُ الْحَارِثِ، نا شُعْبَةُ، عَنْ سُلَيْمَانَ قَالَ: سَمِعْتُ عُمَارَةَ، عَنِ أَبِي الْأَحْوَصِ قَالَ: كَانَ عَبْدُ اللَّهِ يَقُولُ: "اقْرَءُوا الْقُرْآنَ فِي كُلِّ سَبْعٍ، فَذَكَرَ مِثْلَهُ .

١٣١ - عبد اللهی كوڕی مسعود رضي الله عنه دەفەرمووێ : قورئان بخوێننەوە لە هەموو هەفتەیەکدا، جا بە هەمان شێوە باسی کرد .

١٣٢ - حَدَّثَنِي يُونُسُ بْنُ حَبِيبٍ الْأَصْبَهَانِيُّ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ قَالَ: ثنا شُعْبَةُ قَالَ: حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ ذَكْوَانَ قَالَ شُعْبَةُ: وَكَانَ كَخَيْرِ الرِّجَالِ قَالَ: سَمِعْتُ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ يُحَدِّثُ: «أَنَّ أَبَاهُ كَانَ يَخْتِمُ فِي رَمَضَانَ فِي ثَلَاثٍ، وَفِي غَيْرِ رَمَضَانَ مِنَ الْجُمُعَةِ لِلْجُمُعَةِ» .

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: لَمْ يَرْوِ شُعْبَةُ عَنْهُ إِلَّا هَذَا .

**١٣٢** - عبد الرحمن كوڕی عبد الله كوڕی مسعود رضي الله عنه دەگێڕێتەوە : كەوا باوكی لە مانگی ڕەمەزان خەتمی قورئانی دەكرد لە سێ ڕۆژدا وە لە جگە لە ڕەمەزان لە جومعەوە بۆ جومعە خەتمێكی دەكرد .

أبو داود وتی : شعبة ڕیوایەتی لێوە نەكردووە ئیللا ئەوە نەبێ .

## باب : (٨)

## (مَنْ كَانَ يَخْتِمُ فِي سَبْعٍ وَثَمَانٍ : ئەوەی خەتمی قورئانی دەکرد لە حەوت ڕۆژ یان هەشت ڕۆژدا)

**١٣٣** - حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ أَبِي قِلَابَةَ، عَنْ أَبِي الْمُهَلَّبِ، عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ أَنَّهُ قَالَ: «إِنَّا لَنَقْرَأُ الْقُرْآنَ فِي ثَمَانٍ» .

**١٣٣** - لە ئوبەی کوڕی کعب ەوە رضي الله عنه دەفەرموێ : ئێمە قورئانمان دەخوێندەوە **[و اتە خەتممان دەکرد]** لە هەشت ڕۆژدا .

**١٣٤** - حَدَّثَنَا عَبْدُ الْأَعْلَى، نا وُهَيْبٌ، نا أَيُّوبُ، عَنْ أَبِي قِلَابَةَ، عَنْ أَبِي الْمُهَلَّبِ، عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ أَنَّهُ قَالَ: «أَمَّا أَنَا فَأَقْرَأُ الْقُرْآنَ، فِي ثَمَانِ لَيَالٍ» .

**١٣٤** - ئوبەی کوڕی کعب رضي الله عنه دەفەرمووێ : بەڵام من قورئان دەخوێنمەوە لە هەشت شەودا .

**١٣٥** - حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ، نا أَيُّوبُ، عَنْ أَبِي قِلَابَةَ، عَنْ أَبِي الْمُهَلَّبِ قَالَ: «كَانَ أُبَيُّ يَقْرَأُهُ فِي ثَمَانِ لَيَالٍ» يَعْنِي الْقُرْآنَ .

**١٣٥** - أبي المهلب دەڵێت : ئوبەی كوڕی كعب رضي الله عنه قورئانی دەخوێندەوە لە هەشت شەودا .

**١٣٦** - حَدَّثَنَا عَبْدُ الْأَعْلَى بْنُ حَمَّادٍ، نا وُهَيْبٌ، نا خَالِدٌ، عَنْ أَبِي قِلَابَةَ، عَنْ أَبِي الْمُهَلَّبِ، عَنْ أَبِي بْنِ كَعْبٍ أَنَّهُ: «كَانَ يَخْتِمُ الْقُرْآنَ فِي ثَمَانِ لَيَالٍ .

وَكَانَ تَمِيمٌ الدَّارِيُّ يَخْتِمُ فِي سَبْعٍ» .

**١٣٦** - له أبي المهلب لە ئوبەی كوڕی كعب ـــەوە رضي الله عنه كەوا قورئانی خەتم دەكرد لە هەشت شەودا .

وە تميمي داري رضي الله عنه خەتمی قورئانی دەكرد لە حەوت شەودا .

**١٣٧** - حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْحَسَنِ الْبَلْخِيُّ قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ الْمُبَارَكِ، أَخْبَرَنَا عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ مَوْهَبٍ قَالَ: سَمِعْتُ مُحَمَّدَ بْنَ كَعْبٍ الْقُرَظِيَّ يَقُولُ: «لَئِنْ أَقْرَأَ فِي لَيْلَتِي، حَتَّى أُصْبِحَ: إِذَا زُلْزِلَتْ، وَالْقَارِعَةَ، لَا أَزِيدُ عَلَيْهِمَا، أَتَرَدَّدُ فِيهِمَا، وَأَتَفَكَّرُ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ أَنْ أَهُذَّ الْقُرْآنَ لَيْلَتِي هَذًّا» .

**١٣٧** - محمد كوڕی كعب القرظي دەڵێت : ئەگەر لە شەوێكدا بەس (اذا زلزلت) و (القارعة) بخوێنمەوە تا بەیانی دەكەمەوە زیادی نەكەم لەسەریان دووبارەیان بكەمەوە و بیر بكەمەوە لێیان [واته به

تەدەبوورو تێفکرینەوە بیخوێنمەوە] خۆشەویسترە لە لام لەوەی بەدرێژایی شەوەکە بەخێرایی قورئان بخوێنمەوە .

١٣٨ - حَدَّثَنَا نَصْرُ بْنُ عَلِيٍّ، حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ دَاوُدَ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ أَنَّهُ: «كَانَ يَخْتِمُ فِي كُلِّ سَبْعٍ» .

١٣٨ - لە هیشامی کوڕی عروة لە باوکیەوە کەوا خەتمی قورئانی دەکرد لە حەوت ڕۆژدا .

١٣٩ - حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ: «أَنَّ عَلْقَمَةَ كَانَ يَقْرَأُ فِي خَمْسٍ .

قَالَ: وَقَرَأَهُ فِي مَكَّةَ فِي لَيْلَةٍ» .

١٣٩ - لە ئیبراهیم ـەوە کەوا علقمة قورئانی خەتم دەکرد لە پێنج ڕۆژدا .

وتی : وە لە مەککەدا قورئانی خەتم کرد لە شەوێکدا .

١٤٠ - حَدَّثَنَا عُثْمَانُ بْنُ أَبِي شَيْبَةَ، حَدَّثَنَا جَرِيرُ بْنُ عَبْدِ الْحَمِيدِ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ قَالَ: «كَانَ عَلْقَمَةُ يَقْرَأُ الْقُرْآنَ فِي خَمْسٍ» .

وَعَنْ مَنْصُــورٍ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ عَلْقَمَةَ قَالَ: «قَرَأَ الْقُرْآنَ فِي لَيْلَةٍ، وَطَافَ بِالْبَيْتِ أُسْبُوعًا، وَصَلَّى عِنْدَ الْمَقَامِ رَكْعَتَيْنِ، فَقَرَأَ بِالْمِئِينَ .

ثُمَّ طَافَ بِالْبَيْتِ أُسْــبُوعًا، ثُمَّ صَــلَّى رَكْعَتَيْنِ، فَقَرَأَ بِالْمَثَانِ، ثُمَّ طَافَ بِالْبَيْتِ أُسْبُوعًا، وَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ، فَقَرَأَ بِبَقِيَّةِ الْقُرْآنِ» .

**١٤٠** - له ئیبراهیم ــەوە وتی : علقمة قورئانی خەتم دەکرد لە پێنج ڕۆژدا .

وە لە منصــور ـــەوە، لە ئیبراهیم ـــەوە ، لە علقمة وتی : قورئانی خوێندەوە لە شەوێکدا و تەوافی کرد بە دەوری کەعبەدا حەوت جار، وە دوو ڕکاعەت نوێژی کرد لە لای مقامی ئیبراهیم علیه السلام جا قورئانی خوێندەوە **[ئەو سوڕەتانەی سەد ئایەت زیاترە والله اعلم]** .

پاشـــان تەوافی کرد بە دەوری کەعبەدا حەوت جار، وە دوو ڕکاعەت نوێژی کرد، جا المثاني خوێندەوە پاشـــان تەوافی کرد بە دەوری کەعبەدا وە دوو ڕکاعەت نوێژی کرد جا ئەوەی مابوو لە قورئان خوێندیەوە .

**١٤١** - حَدَّثَنَا شَــيْبَانُ بْنُ فَرُّوخٍ، حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ عَلْقَمَةَ: «أَنَّهُ كَانَ بِمَكَّةَ فِي لَيْلَةٍ طَافَ فَقَرَأَ السَّــبْعَ، ثُمَّ طَافَ طَوَافًا آخَرَ فَقَرَأَ بِالْمَثَانِ، ثُمَّ طَافَ طَوَافًا آخَرَ، فَقَرَأَ مَا بَقِيَ فِي لَيْلَةٍ وَاحِدَةٍ».

قَالَ: وَكَانَ الْأَسْوَدُ يَخْتِمُ الْقُرْآنَ فِي سِتٍّ، وَفِي رَمَضَانَ فِي كُلِّ لَيْلَتَيْنِ .

**١٤١** - علقمة شـــەوێكيـان لە مەككـە مايەوە تەوافی كـرد جـا السـبع [لە سـورەتی البقرة تاوەكو كۆتايی سـورەتی يونس] ــــی خوێندەوە پاشـان جارێكی تر تەوافی كـردەوە جا المثانی خوێندەوە پاشـان جارێكی تر تەوافی كـردەوە جا ئەوەی مابوو خوێنديەوە لە يەك شـەودا .

وتی : الأســود قورئـانی خەتم دەكـرد لە شـــەش ڕۆژدا وە مـانگی ڕەمەزاندا لە هەموو دوو شەوێكـدا .

**١٤٢** - حَـدَّثَنَا أَبُو بَكْرِ بْنُ أَبِي شَــيْبَةَ، حَـدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ هَمَّامٍ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ يَزِيدَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الشِّــخِّيرِ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ قَرَأَ الْقُرْآنَ فِي أَقَلَّ مِنْ ثَلَاثٍ، فَلَمْ يَفْقَهُّ» .

**١٤٢** - لە عبد اللّٰەی كـوڕی عمرو ــــەوە رضـي اللّٰە عنە فەرمووی : رســـول اللّٰە ﷺ دەفەرمووێ : (ئەوەی قورئـان بخوێنێتەوە لە كـەمتر لە سێ شـەو ئەوا لێی تێنەگەیشتوو) .

**١٤٣** - حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ هَمَّامٍ، عَنْ قَتَادَةَ، نَحْوَهُ .

**١٤٣** - لە قتادة ـەوە بە هەمان شێوە .

**١٤٤** - حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يَسَـارٍ، حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ، أَخْبَرَنَا هَمَّامٌ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ يَزِيدَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ أَنَّ رَسُـولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ لَهُ: «اقْرَأِ الْقُرْآنَ فِي شَهْرٍ» .

قَالَ: إِنِّي أَقْوَى مِنْ ذَلِكَ .

قَالَ: «اقْرَأْهُ فِي كَذَا» .

قَالَ: إِنِّي أَقْوَى مِنْ ذَلِكَ .

قَالَ: «اقْرَأْهُ فِي سَبْعٍ» .

قَالَ: إِنِّي أَقْوَى مِنْ ذَلِكَ .

قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا يَفْقَهُ مَنْ قَرَأَهُ فِي أَقَلَّ مِنْ ثَلَاثٍ» .

**١٤٤** - لە عبد اللهی کوڕی عمرو ــی کوڕی عاص ــەوە رضي الله عنه .

بێگومان رسـول الله ﷺ پێی فەرموو : (قورئان بخوێنەوە لە مانگێکدا .

وتی : من توانام زیاترە لەوە .

فەرمووی : بیخوێنەوە لەوەندە ڕۆژەدا .

وتی : من لەوە زیاتر دەتوانم بیخوێنمەوە .

فەرمووی : بیخوێنەوە لە حەوت ڕۆژدا .

وتی : من توانام زیاترە لەوە .

رســول الله ﷺ فەرمووی : ئەوەی قورئان بخوێنێتەوە لە کەمتر لە سێ ڕۆژ ئەوا لێی تێناگات) .

**١٤٥** - حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّــارٍ، ثنا مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ، ثنا شُــعْبَةُ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ يَزِيدَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ أَبِي الْعَلَاءِ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ قَرَأَ الْقُرْآنَ فِي أَقَلَّ مِنْ ثَلَاثٍ فَلَمْ يَفْقَهْهُ» .

**١٤٥** - لە عبد الله ی کوڕی عمرو ـەوە رضي الله عنه لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەفەرمووێ : (ئەوەی قورئان بخوێنێتەوە لە کەمتر لە سێ شەو ئەوا لێی تێنەگەیشتووە) .

**١٤٦** - حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ مِسْعَرٍ، وَسُفْيَانَ، عَنْ عَلِيِّ بْنِ بَذِيمَةَ، عَنْ أَبِي عُبَيْدَةَ قَالَ: قَالَ عَبْدُ اللَّهِ: «مَنْ قَرَأَهُ فِي أَقَلَّ مِنْ ثَلَاثٍ، فَهُوَ رَاجِزٌ» .

**١٤٦** - عبد الله ی کوڕی مسعود رضي الله عنه دەفەرمووێ : ئەوەی قورئان بخوێنێتەوە [و اتە خەتمی بکات] بە کەمتر لە سێ ڕۆژ ئەوە وەك کەسێکە کە شیعر بە خێرایی دەخوێنێتەوە .

**١٤٧** - حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، حَدَّثَنَا أَبُو الْأَحْوَصِ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ أَبِي عُبَيْدَةَ قَالَ: قَالَ عَبْدُ اللهِ: «مَنْ قَرَأَ الْقُرْآنَ فِي أَقَلَّ مِنْ ثَلَاثٍ، فَهُوَ رَاجِزٌ، هَذًّا كَهَذِّ الشِّعْرِ، وَنَثْرًا كَنَثْرِ الدَّقَلِ» .

**١٤٧** - عبد الله ی كوڕی مسعود رضي الله عنه دەفەرمووێ : ئەوەی قورئان بخوێنێتەوە بە كەمتر لە سێ ڕۆژ ئەوە وەك كەسێكە شیعر بە خێرایی بخوێنێتەوە ئەمەش وەك شیعر و پەخشان، پەخشانێكی الدقل **[مەبەستی ئەوەیە ئەوكەسەی كە بەخێر ایی و بێ وردبوونەوە قورئان دەخوێنێتەوە وەكو كەسێك و ایە كە شیعرو نوسراو دەخوێنێتەوە بێ ئەوەی ورد بێتەوە لێی، وە نموونە دێنێتەوە بە الدقل كە خر اپترین جۆری خورمایە، والله اعلم]** .

**١٤٨** - حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْعَلَاءِ، أَخْبَرَنَا يَحْيَى بْنُ آدَمَ، عَنْ إِسْرَائِيلَ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ أَبِي عُبَيْدَةَ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: «مَنْ قَرَأَ الْقُرْآنَ فِي أَقَلَّ مِنْ ثَلَاثٍ، فَهُوَ رَاجِزٌ» .

**١٤٨** - عبد اللەی كوڕی مسعود رضي الله عنه دەفەرمووێ : ئەوەی قورئان بخوێنێتەوە بە كەمتر لە سێ ڕۆژ ئەوە وەك خوێندنەوەی شیعرە بە خێرایی .

**١٤٩** - حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ عَاصِمٍ، عَنْ زِرٍّ قَالَ: قَالَ عَبْدُ اللَّهِ: «أَدِيمُوا النَّظَرَ فِي الْمُصْحَفِ» .

**١٤٩** - عبـد اللّهى كورِى مســعود رضــي الله عنـه دەفەرمووێ : بەردەوام سەيرى المصحف **[قورئان]** بكەن .

---

**ڕوونكردنەوە : محقق دەڵێت ئەم ئەثەرە بەڵگەيە لەســەرئەوەى قورئان خوێندن لەسەرالمصحف داواكراوە بۆئەوەى المصحف پەكنەخرێ وهيچى تێدا نەخوێندرێتەوە، وە لەوانەيە هەندێك لەبەركارى قورئان شــتێكيان لەبير چووبێتەوە جا دێتەوە بيريان، يان وشــەيەكيان لێ گۆڕابێت يان ئايەتێك، يان تووشــى پێشــخســتن يان دواخســتن بووبێتن، جا تێبينى كردن وگەڕانەوە بۆ المصــحف جێگيرتريان دەكات لە خوێندنەوەى قورئان بە لەبەركردن والله اعلم.**

## باب : (٩)

## (النَّظَرِ فِي الْمُصْحَفِ : سەيركردنی المصحف)

**١٥٠** - حَدَّثَنَا مُزَاحِمُ بْنُ سَعِيدٍ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ الْمُبَارَكِ أَخْبَرَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عَاصِمٍ، عَنْ زِرٍّ، عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: «أَدِيمُوا النَّظَرَ فِي الْمُصْحَفِ» .

**١٥٠** - عبد اللّەی کوڕی مسعود رضي الله عنه دەفەرمووێ : بەردەوام سەیری ناو المصحف [قورئان] بکەن .

**١٥١** - حَدَّثَنَا أَبُو كَامِلٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الْوَاحِدِ بْنُ زِيَادٍ، عَنِ الْأَعْمَشِ، عَنْ خَيْثَمَةَ قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو، وَإِنْسَانٌ قَدْ أَخَذَ عَلَيْهِ الْمُصْحَفَ، وَهُوَ يَقْرَأُ .

فَقُلْتُ: مَا هَذَا؟

قَالَ: «أَقْرَأُ جُزْئِي الَّذِي أَقُومُ بِهِ اللَّيْلَ» .

**١٥١** - خيثمة دەڵێت : چوومە لای عبد الله ی کوڕی عمرو رضي الله عنه وە کەسێك کە المصحفی لێوەرگرتبوو جا لەسەر المصحف قورئانی دەخوێندەوە .

پێم وت : ئەوە چییە؟

عبد اللە ـــى كوڕى عمرو فەرمووى : ئەو بەشـــە قورئانەی خۆم دەخوێنمەوە كە ئەم شەو دەمەوێت لە شەو نوێژدا بیخوێنمەوە .

**١٥٢** - حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، أَخْبَرَنَا وَكِيعٌ، عَنْ سُـــفْيَانَ، عَنْ مَنْصُـــورٍ، عَنْ مُجَاهِدٍ، عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها أَنَّهَا «كَانَتْ تَقْرَأُ فِي رَمَضَانَ فِي الْمُصْحَفِ بَعْدَ الْفَجْرِ، فَإِذَا طَلَعَتِ الشَّمْسُ نَامَتْ» .

**١٥٢** - دایكمان عـائشـــة رضـــي اللە عنها لە ڕەمەزاندا لەســـەر المصـــحف قورئـانی دەخوێنـدەوە دوای نوێژی بەیـانی هەتـاوەكو ڕۆژ هەڵدەهات جا دەخەوت .

**١٥٣** - حَدَّثَنَا عُثْمَانُ بْنُ أَبِي شَـــيْبَةَ أَخْبَرَنَا جَرِيرُ عَنْ مَنْصُـــورٍ، عَنْ مُجَاهِدٍ قَالَ: «كَانَتْ عَائِشَـــةُ رضـــي الله عنها فِي رَمَضَـــانَ تَأْمُرُ إِنْسَـــانًا إِذَا أَصْبَحَتْ وَصَلَّتْ أَنْ يَنْظُرَ الشَّمْسَ وَهِيَ جَالِسَةٌ .

فَإِذَا قَالَ: قَدْ طَلَعَتْ وَضَعَتْ رَأْسَهَا» .

**١٥٣** - مجاهد دەڵێت : عائشـــة رضـــي اللە عنها لە ڕەمەزاندا كـاتێك بەیانی دەكردەوە و نوێژی دەكرد فەرمانی دەكرد بە كەسـێك كەوا سەیری ڕۆژ بكـات وە ئەو [دایكە عائشة رضي الله عنها] دانیشتبوو .

جا كاتێك بیگووتبا ئەوە ڕۆژ هەڵات دایكە عائشـة رضـي الله عنها دەخەوت .

**١٥٤** - حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، أَخْبَرَنَا وَكِيعٌ، عَنْ سُـفْيَانَ، عَنْ مَنْصُـورٍ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنِ الْأَسْـوَدِ، عَنْ عَائِشَـةَ، رضـي الله عنها قَالَتْ: «إِنِّي لَأَقْرَأُ حِزْبِي وَأَنَا مُضْطَجِعَةٌ عَلَى سَرِيرِي» .

**١٥٤** - دایكە عائشـة رضـي الله عنها دەفەرمووێ : بەڕاسـتی من حزبەكەی خۆم دەخوێنمەوە لە قورئـان لەكـاتێكـدا پـاڵكەوتووم لەسەر جێگاكەم

**١٥٥** - حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، أَخْبَرَنَا وَكِيعٌ، عَنْ أَفْلَحَ، عَنِ الْقَاسِمِ قَالَ: دَخَلْنَا عَلَى عَائِشَـةَ رضـي الله عنها وَكَانَتْ تُصَلِّي بَعْدَ الْفَجْرِ، فَقُلْنَا لَهَا قَالَتْ: «إِنِّي نِمْتُ عَنْ حِزْبِي، أَوْ جُزْئِي، فَلَمْ أَكُنْ لِأَدَعَهُ» .

**١٥٥** - لە قاسم ـەوە، وتی : چووینە لای عائشة رضي الله عنها نوێژی دەكرد لە دوای نوێژی بەیانی جـا پێمـان وت : فەرمووی : من خەوم لێكەوت لەسـەر حزبەكەم یان بەشـەكەم [و اتە تەواوم نەكرد والله اعلم] جا نەمویست وازیلێبهێنم .

**١٥٦** - حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، عَنْ مَالِكِ بْنِ أَنَسٍ، عَنْ نَافِعٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مِثْلُ صَاحِبِ الْقُرْآنِ كَمَثَلِ صَاحِبِ الْإِبِلِ الْمُعَلَّقَةِ إِنْ عَاهَدَ عُقُلَهَا أَمْسَكَهَا، وَإِنْ أَطْلَقَهَا ذَهَبَتْ» .

**١٥٦** - له عبد الله ـى كوڕى عمر رضي الله عنهما فەرمووى : رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (بێگومان نموونەی کەسێك کە قورئان دەزانێت بخوێنێتەوە بە دڵ [واتە لەبەریەتی والله اعلم] وەکو کەسێکە خاوەنی وشتری بەستراوە بە گوریس، ئەگەر بەبەستراوەیی بیانهێڵێتەوە ئەوا کۆنترۆڵیان دەکات، بەڵام ئەگەر بەڕەڵایان بکات ئەوا دووردەکەونەوە و ڕادەکەن) .

---

ڕوونکردنەوە : ئەم فەرموودە بەڵگەیە لەسەر هاندان بۆ بەردەوام خوێندنەوەی قورئان وە ئاگادارکردنەوەیە بۆ لەبیرنەکردنی قورئان والله اعلم .

## باب : (١٠)

## (بَابُ مَا جَاءَ فِي تَعَاهُدِ الْقُرْآنِ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ : دەروازەی ئەوەی هاتووە دەربارەی پەیوەست بوون بە قورئانەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ)

**١٥٧** - حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، أَخْبَرَنَا يَعْقُوبُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ مُوسَى بْنِ عُقْبَةَ، عَنْ نَافِعٍ عَنِ ابْنِ عُمَرَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِنَّمَا مَثَلُ الْقُرْآنِ كَمَثَلِ الْإِبِلِ الْمُعَلَّقَةِ، إِنْ عَاهَدَ صَاحِبُهَا عَلَى عُقُلِهَا أَمْسَكَهَا، وَإِذَا أَغْفَلَهَا ذَهَبَتْ، إِذَا قَامَ صَاحِبُ الْقُرْآنِ، فَقَرَأَهُ بِاللَّيْلِ وَالنَّهَارِ ذَكَرَهُ، وَإِنْ لَمْ يَقْرَأْهُ نَسِيَهُ» .

**١٥٧** - لە عبد اللّەی کوڕی عمر رضي الله عنهما کەوا رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (بێگومان نمونەی قورئان وەکو وشتری بەستراوە بە گوریس، ئەگەر خاوەنەکەی بەبەستراوەیی بیهێڵێتەوە ئەوا کۆنترۆڵی دەکات، بەڵام ئەگەر بێ ئاگابوو لێی ئەوا لەدەستی دەڕوات، ئەگەر کەسی قورئان خوێن هەستا بە خوێندنەوەی قورئان بە شەو و بە ڕۆژ ئەوا دێتەوە یادی بەڵام ئەگەر نەیخوێندەوە ئەوا لە بیری دەچێتەوە) .

١٥٨ - حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ مُوسَى، أَخْبَرَنَا أَنَسُ بْنُ عِيَاضٍ، وَحَدَّثَنِي مُوسَى بْنُ عُقْبَةَ، عَنْ نَافِعٍ قَالَ: قَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَذَكَرَ نَحْوَهُ .

١٥٨ - له عبد اللّهى كوڕى عمر رضي الله عنهما فەرمووى : رسول الله ﷺ دەفەرمووێ جا بەهەمان شێوەى پێشوو گێڕایەوە .

١٥٩ - حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ مُوسَى، حَدَّثَنَا أَنَسٌ قَالَ: وَحَدَّثَنِي عُبَيْدُ اللَّهِ عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِنَّمَا مَثَلُ الْقُرْآنِ كَمَثَلِ الْإِبِلِ الْمُعَلَّقَةِ، إِنْ تَعَاهَدَ صَاحِبُهَا بِعُقُلِهَا أَمْسَكَهَا، وَإِنْ أَطْلَقَ عُقُلَهَا ذَهَبَتْ».

١٥٩ - له عبد اللّهى كوڕى عومەرەوە رضي الله عنهما فەرمووى : رسول الله ﷺ دەفەرمووێ : (بێگومان نمونەى قورئان وەكو وشترى بەستراوە بە گوريس، ئەگەر خاوەنەكەى بەبەستراوەيى بيهێڵێتەوە ئەوا كۆنترۆڵى دەكات، بەڵام ئەگەر بەرەڵاى بكات ئەوا لەدەستى دەڕوات).

١٦٠ - حَدَّثَنَا عُثْمَانُ بْنُ أَبِي شَيْبَةَ، أَخْبَرَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، وَأَبُو الْأَحْوَصِ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «بِئْسَ مَا لِأَحَدِهِمْ أَنْ يَقُولَ: نَسِيتُ آيَةَ كَيْتَ وَكَيْتَ، بَلْ هُوَ نُسِّيَ، فَاسْتَذْكِرُوا الْقُرْآنَ، فَلَهُوَ أَشَدُّ تَفَصِّيًا مِنْ صُدُورِ الرِّجَالِ مِنَ النَّعَمِ بِعُقُلِهَا» .

١٦٠ - لە عبد اللهى كوڕى مسعودەوە رضي الله عنه دەفەرمووێ :
رسـول الله ﷺ فەرمووى : (شـتێكى زۆر خراپە كەوا يەكێك لە ئێوە بڵێت ئەوەندە و ئەوەندە ئايەتەم لە قورئان لەبیر چووەتەوە، بەڵكو لەبیری براوەتەوە [لە لايەن الله تعالى ـەوە]، پێویستە بەردەوام قورئان بخوێننەوە چونكە ئەو لە دڵى پیاو دەردەچێت خێراتر لە وشـتر كە ئەو گوریسەى پێى بەستراوە دەبێتەوە) .

١٦١ - حَدَّثَنَا مُزَاحِمُ بْنُ سَعِيدٍ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ الْمُبَارَكِ أَخْبَرَنَا شُعْبَةُ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: «بِئْسَ مَا لِأَحَدِهِمْ أَنْ يَقُولَ نَسِيتُ آيَةَ كَيْتَ وَكَيْتَ، بَلْ هُوَ نُسِّيَ، فَاسْتَذْكِرُوا الْقُرْآنَ، فَإِنَّهُ أَشَدُّ تَفَصِّيًا مِنْ صُدُورِ الرِّجَالِ مِنَ النَّعَمِ مِنْ عُقُلِهِ» .

١٦١ - عبد اللهى كوڕى مسعود رضي الله عنه دەفەرمووێ :
(شـتێكى زۆر خراپە كەوا يەكێك لە ئێوە بڵێت ئەوەندە و ئەوەندە ئايەتەم لە قورئان لەبیر چووەتەوە، بەڵكو لەبیری براوەتەوە [لە لايەن الله تعالى ـەوە]، پێویستە بەردەوام قورئان بخوێننەوە چونكە ئەو لە دڵى پیاو دەردەچێت خێراتر لە وشـتر كە ئەو گوریسەى پێى بەستراوە دەبێتەوە) .

١٦٢ - حَدَّثَنَا مُزَاحِمُ بْنُ سَعِيدٍ، أَخْبَرَنَا ابْنُ الْمُبَارَكِ قَالَ: حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ عَلِيِّ بْنِ رَبَاحٍ قَالَ: سَمِعْتُ أَبِي يَقُولُ: سَمِعْتُ عُقْبَةَ بْنَ عَامِرٍ يَقُولُ: قَالَ

رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «تَعَلَّمُوا كِتَابَ اللَّهِ، وَتَعَاهَدُوهُ، وَتَغَنُّوا بِهِ، وَاقْتَنُوهُ، فَوَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ لَهُوَ أَشَدُّ تَفَصِّيًا مِنَ الْمَخَاضِ فِي الْعُقُلِ».

**١٦٢** - عقبة كوڕى عامر دەفەرمووێ: رسـول الله ﷺ فەرمووى: (كتابى الله عزَّ وَجَل [قورئان] فێر ببن و بەردەوام بن لەسەر خوێندنەوەى و لەبەرى بكەن وە بە دەنگى خۆش بيخوێننەوە وە دەستى بەسەردا بگرێت [بەدڵ و عەقڵ و ڕۆح، بەواتايەكى تر پێداگربێ لە تەدەبور كردن لێى، كردەوەكردن پێى، والله اعلم]، سوێند بەوكەسەى نەفسى منى بەدەستە قورئان دووردەكەوێتەوە [لەبيردەكرێ] خێراتر لەو ووشترەى كە گوريسەكەى دەبێتەوە).

**١٦٣** - حَدَّثَنَا عُثْمَانُ، أَخْبَرَنَا زَيْدُ بْنُ الْحُبَابِ، حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ عَلِيِّ بْنِ رَبَاحٍ قَالَ: سَمِعْتُ أَبِي يَقُولُ: سَمِعْتُ عُقْبَةَ بْنَ عَامِرٍ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «تَعَلَّمُوا الْقُرْآنَ، وَغَنُّوا بِهِ، وَاقْتَنُوهُ، فَوَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَهُوَ أَشَدُّ تَفَصِّيًا مِنَ الْمَخَاضِ فِي الْعُقُلِ».

**١٦٣** - هەمان ئەثەرى (**١٦٢**).

**١٦٤** - حَدَّثَنَا مِنْجَابُ بْنُ الْحَارِثِ، أَخْبَرَنَا ابْنُ مُسْهِرٍ، عَنِ الْأَعْمَشِ، عَنْ شَقِيقٍ قَالَ: أُتِيَ عَبْدُ اللَّهِ بِمُصْحَفٍ قَدْ زُيِّنَ بِذَهَبٍ، فَقَالَ: «إِنَّ أَحْسَنَ مَا زُيِّنَ تِلَاوَتُهُ فِي الْحَقِّ».

**١٦٤** - شـقيق دەڵێت مصحفێك هێنرا بۆ عبد اللهى كـوڕى مسـعود رضـي الله عنه كـه به زێڕ ڕازێنرابوويەوە جا فەرمووی : بەڕاسـتى باشـترين شتێك كـه قورئانى پێبڕازێنرێتەوە خوێندنەوەيەتى لە حەقدا .

---

**ڕوونكـردنەوە : محقق دەڵێت : حوكـمى ڕازاندنەوەى مصحف بە جگە لە جوان خوێندنەوەى مەكـروهە بەڵگەش هەيە لەسـەلەفەوە لەسـەركـەڕاهەتى ڕازاندنەوەى قورئان بە زێڕو شــتى هەروەك ئيمامى ابن ابي شــيبة هێناويەتى لە مصنفەكـەى : ئەثەرى (١٠٢٨١، ١٠٤٨٧، ١٠٢٨٥) .**

**بەڕاسـتى ئەو ئەثەرانە بەڵگەيە لەسـەركـەڕاهيەتى ڕازاندنەوەى قورئان بە زێڕو شتى تروە ڕازاندنەوەى مصحف وا دەكـات چاوى دزو چەتەكـانى بكـەوێتە سـەرو بيـدزن بۆئەوەى سـوود وەربگرن لەو شـتـانەى كـە مصـحفەكـەى پێڕازێنراوەتەوە وە لەوكـارەدا بەفيرۆدانى ماڵ و سـامان هەيە وە لەپێشـترە كـەوا ئەو مـاڵ و سـامـانە خەرج بـكـرێ بـۆ سـوود گەيـانـدن بە هەژارو خـاوەن پێويسـتييەكـان، وە لەسـەرئەهلى قورئان پێويسـتە بزانن كـەوا باشـترين شـت كـە قورئانى پێبڕازێنرێتەوە خوێندنەوەيەتى وە شـوێنكـەوتنى ئەوەى پێى هاتووە لە فەرمانكـردن (فەرمانەكـانى جێبەجێ بكـرێ) وە وەسـتان لەلاى سـنوورەكـانى (واتە سـنوورەكـانى نەبەزێنرێ) وە بەڕاسـتخسـتنەوەى ئەوەى كـە هەواڵى پێداوە لە ڕابردوو و داهاتوودا، وە ئەوەى لە نێوانيانە، جا بە ئاگا وەرنەوە ئەى ئوممەتى ئيسلام زۆربەباشى .**

**١٦٥** - حَـدَّثَنَا يَعْقُوبُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ بْنِ هِشَـامٍ، عَنْ دَاوُدَ بْنِ أَبِي هِنْـدَ، عَنْ عِكْرِمَةَ: ﴿يَتْلُونَهُ حَقَّ تِلَاوَتِهِ﴾ [البقرة: ١٢١] .

قَالَ: «يَتَّبِعُونَهُ حَقَّ اتِّبَاعِهِ» .

١٦٥ - له عكرمة وه ﴿يَتْلُونَهُ حَقَّ تِلَاوَتِهِ﴾ [البقرة: ١٢١] .

دەڵێت : شوێنی دەکەون بە باشترین شوێن کەوتن .

١٦٦ - حَدَّثَنَا يَعْقُوبُ، أَخْبَرَنَا وَكِيعٌ، أَخْبَرَنَا سُفْيَانُ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ قَالَ: «تِلَاوَتُهُ حَقَّ تِلَاوَتِهِ .

قَالَ: يَتَّبِعُونَهُ حَقَّ اتِّبَاعِهِ، وَيَعْمَلُونَ بِهِ حَقَّ عَمَلِهِ» .

١٦٦ - إبراهيم النخعي دەڵێت : خوێندنەوەکەی بە چاکترین خوێندنەوە .

وتی شوێنی دەکەون بە چاکترین شوێن کەوتن وە کاری پێدەکەن بە چاکترین شێوە [حەڵاڵی بە حەڵاڵ دەزانن و حەرامی بە حەرام دەزانن] .

١٦٧ - حَدَّثَنَا يَعْقُوبُ قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ مُبَارَكٍ عَنِ الْحَسَنِ فِي قَوْلِهِ عز وجل: ﴿الَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الْكِتَابَ يَتْلُونَهُ حَقَّ تِلَاوَتِهِ﴾ [البقرة: ١٢١] .

قَالَ: يَعْمَلُونَ بِمُحْكَمِهِ، وَيُؤْمِنُونَ بِمُتَشَابِهِهِ، وَيَكِلُونَ مَا شُكِلَ عَلَيْهِمْ إِلَى عَالِمِهِ .

**١٦٧** - له حسن البصري لەبارەی وتەی الله عزَّ وَجَل : ﴿الَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الْكِتَابَ يَتْلُونَهُ حَقَّ تِلَاوَتِهِ﴾ **[البقرة: ١٢١]** .

دەڵێت : کار دەکەن بە موحکەمەکەی **[ئەو ئایەتانەی ڕۆشــن و دامەزراون]**، وە ئیمان دەهێنن بە موتەشـــابیهەکانی **[ئەو ئایەتانەی ڕۆشــنین و مانای جۆراو جۆر هەڵدەگرن]**، وە ئەوەی کەوا تووشی ئیشکال بوون تێیدا دەیگەڕێننەوە بۆ ئەو کەسەی کەوا زانایە پێی **[الله عزَّوَجَل]** .

**١٦٨** - حَدَّثَنَا يَعْقُوبُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ قَالَ: حَدَّثَنَا وَهْبُ بْنُ جَرِيرٍ، حَدَّثَنَا أَبِي: أَنَّهُ سَمِعَ الْحَسَنَ يَقُولُ: «إِنَّ الْمُسْلِمِينَ شُهُودُ اللَّهِ فِي الْأَرْضِ يَعْرِضُونَ أَعْمَالَ بَنِي آدَمَ عَلَى كِتَابِ اللَّهِ، فَمَا وَاطَأَ كِتَابَ اللَّهِ حَمِدُوا اللَّهَ عَلَيْهِ، وَمَا خَالَفَ كِتَابَ اللَّهِ عَرَّفُوا بِهَذَا الْقُرْآنِ ضَلَالَةَ مَنْ ضَلَّ مِنْ خَلْقِهِ، وَإِنَّ مِنْ أَشْرَارِ النَّاسِ أَقْوَامًا قَرَءُوا هَذَا الْقُرْآنَ لَا يَعْلَمُونَ السُّنَّةَ، وَإِنَّ أَحَقَّ النَّاسِ بِهَذَا الْقُرْآنِ مَنْ تَبِعَهُ بِعَمَلِهِ، وَإِنْ كَانَ لَا يَقْرَأُ» .

**١٦٨** - حسن البصري دەڵێت : بەڕاستی مسوڵمانان شایەتی الله عزَّ وَجَل ــــن لەســەر زەوی کارو کردەوەکانی بەنی ئادەم عەرز دەکەن بەرامبەر کتابی الله تعالى ئەوەی چوونیەك بێت لەگەڵ کتابی الله تعالى سوپاس و ستایشی الله تعالى دەکەن لەسەری وە ئەوەی پێچەوانەی کتابی الله تعالى بێت دەیناسنەوە بەو قورئانە گومڕایی ئەو کەسەی کە گومڕا بووە لە دروستکراوەکانی، بێگومان لە خراپترینی خەڵکی کەسانێکن ئەو قورئانە دەخوێننەوە بەڵام سوننەت نازانن، وە

بێگومان حەکیمترین کەس بەو قورئانە **[واتە پێی بووترێ ئەهلی قورئان]** ئەو کەسەیە کەوا شوێنی دەکەوێ بە کارو کردەوەکەی ئەگەرچی نەیخوێنێتەوە .

## باب : (١١)

## (صِفَةُ الْخَوَارِجِ وَالتَّغْلِيظِ عَلَيْهِمْ : تايبەتمەندى خەواریج و توندبوون لەسەریان)

**١٦٩** - حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عُبَيْدِ بْنِ حِسَابٍ قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ قَالَ: حَدَّثَنَا عَطَاءُ بْنُ السَّائِبِ، عَنْ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ السُّلَمِيِّ قَالَ: «إِنَّمَا أَخَذْنَا الْقُرْآنَ عَنْ قَوْمٍ أَخْبَرُونَا أَنَّهُمْ كَانُوا إِذَا تَعَلَّمُوا عَشْرَ آيَاتٍ لَمْ يُجَاوِزُوهُنَّ إِلَى الْعَشْرِ الْأُخَرِ حَتَّى يَعْلَمُوا مَا فِيهِنَّ مِنَ الْعَمَلِ .

قَالَ: فَتَعَلَّمْنَا الْعِلْمَ وَالْعَمَلَ جَمِيعًا، وَأَنَّهُ سَيَرِثُ الْقُرْآنَ بَعْدَنَا قَوْمٌ يَشْرَبُونَهُ شُرْبَ الْمَاءِ لَا يُجَاوِزُ هَذَا، وَأَشَارَ بِيَدِهِ إِلَى حَنَكِهِ» .

**١٦٩** - أبو عبد الرحمن دەڵێت : بەڕاستی قورئانمان وەرگرت لە کۆمەڵێك هەواڵیان پێداین کەوا ئەگەر دە ئایەت فێر ببوونایە نەدەڕۆیشتن بۆ دە ئایەتی دواتر هەتاوەکو فێردەبوون ئەوەی تێیدایە لە کار و کردەوە .

وتی : جا زانست و کارو کردەوەیان فێردەکردین پێکەوە، وە بێگومان کۆمەڵێك لە دوای ئێمە قورئان بە میرات دەگرن دەیخۆنەوە وەکو خواردنەوەی ئاو لێرە تێناپەڕێت بەدەستی ئاماژەی کرد بۆ قوڕگی

[و اته تەنها دەیخوێننەوە و لەبەری دەکەن بۆ ئەوەی لێی تێبگەن و کاری پێبکەن والله اعلم] .

١٧٠ - حَدَّثَنَا عَبْدُ الْأَعْلَى بْنُ حَمَّادٍ قَالَ: حَدَّثَنَا وُهَيْبُ بْنُ خَالِدٍ قَالَ: حَدَّثَنَا سَعِيدٌ الْجُرَيْرِيُّ، عَنْ أَبِي نَضْرَةَ، عَنْ أَبِي فِرَاسٍ أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ، خَطَبَ النَّاسَ، فَقَالَ: «أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّمَا كُنَّا نَعْرِفُكُمْ إِذْ يَنْزِلُ الْوَحْيُ، وَإِذِ النَّبِيُّ ﷺ بَيْنَ أَظْهُرِنَا، وَإِذْ أَنْبَأَنَا اللَّهُ مِنْ أَخْبَارِكُمْ، وَقَدْ قُبِضَ النَّبِيُّ ﷺ، وَأَنَّهُ قَدْ كَانَ يُخَيَّلُ إِلَيَّ أَنَّ نَاسًا يَقْرَءُونَ الْقُرْآنَ، وَهُمْ يُرِيدُونَ اللَّهَ وَمَا عِنْدَهُ .

وَقَدْ خُيِّلَ إِلَيَّ بِأَخَرَةَ أَنَّ أُنَاسًا يَقْرَءُونَ الْقُرْآنَ يُرِيدُونَ النَّاسَ وَمَا عِنْدَهُمْ .

أَلَا فَأَرِيدُوا اللَّهَ بِقِرَاءَتِكُمْ وَأَعْمَالِكُمْ، وَمَنْ أَظْهَرَ مِنْكُمْ خَيْرًا ظَنَنَّا بِهِ خَيْرًا وَأَحْبَبْنَاهُ عَلَيْهِ، وَمَنْ أَظْهَرَ مِنْكُمْ شَرًّا ظَنَنَّا بِهِ شَرًّا وَاجْتَنَبْنَاهُ عَلَيْهِ، سَرَائِرُكُمْ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَ رَبِّكُمْ» .

١٧٠ - عمر ـى کوڕی الخطاب ووتاریدا بۆ خەڵکی جا فەرمووی : ئەی خەڵکینە بێگومان خۆتان دەزانن کاتێك وەحی دادەبەزی لە کاتێکدا کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەناوماندا بوو الله تعالى هەواڵی ئێوەی پێ ڕادەگەیاندین بەڵام بێگومان پێغەمبەری خوا وەفاتی کردووە، بەڕاستی هەواڵم پێدراوە کەوا هەندێك لە خەڵکی قورئان دەخوێننەوە

نییەتیان الله تعالی ـیە وە ئەوەی لەلایەتی **[و اتە چاوەڕێی پاداشت دەکەن لە الله تعالی بەتەنها]** .

وە بێگومان هەواڵم پێدراوە کەوا کۆمەڵێك لە خەڵکی قورئان دەخوێننەوە مەبەستیان خەڵکەو وە ئەوەی لەلایانە .

ئاگاداربن مەبەستتان تەنها الله تعالی بێت لە قورئان خوێندنەوەتان و کار و کردەوەتان، وە ئەو کەسەی چاکە دەربخات لە ئێوە ئێمەش گومانی باشی پێدەبەین وە خۆشمان دەوێت لەسەر ئەوە، وە ئەو کەسەی خراپە دەربخات لە ئێوە گومانی خراپی پێدەبەین وە وازدەهێنین لە نهێنییەکانتان لە نێوان خۆتان و پەروەردگارتان .

**١٧١** - حَدَّثَنَا وَهْبُ بْنُ بَقِيَّةَ، أَخْبَرَنَا خَالِدٌ، عَنِ الْجُرَيْرِيِّ عَنْ أَبِي نَضْرَةَ، عَنْ أَبِي فِرَاسٍ قَالَ: خَطَبَنَا عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ فَقَالَ: «أَيُّهَا النَّاسُ؛ إِنَّمَا كُنَّا نَعْرِفُكُمْ إِذِ النَّبِيُّ ﷺ بَيْنَ أَظْهُرِنَا، وَالْوَحْيُ يَنْزِلُ عَلَيْهِ، وَإِذْ يُنَبِّئُنَا اللَّهُ مِنْ أَخْبَارِكُمْ، وَقَدِ انْطَلَقَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وَانْقَطَعَ الْوَحْيِ، وَإِنَّمَا نَعْرِفُكُمُ الْآنَ بِمَا أَقُولُ لَكُمْ مَنْ أَظْهَرَ مِنْكُمْ خَيْرًا ظَنَنَّا بِهِ خَيْرًا .

وَمَنْ أَظْهَرَ مِنْكُمْ شَرًّا ظَنَنَّا بِهِ شَرًّا وَاجْتَنَبْنَاهُ عَلَيْهِ، سَرَائِرُكُمْ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَ رَبِّكُمْ .

أَلَا وَإِنَّهُ إِنَّا عَلَى زَمَانٍ، وَأَنَا أَدْرِي كُلَّ مَنْ قَرَأَ الْقُرْآنَ إِنَّمَا يُرِيدُ اللَّهَ وَمَا عِنْدَهُ، وَقَدْ خُيِّلَ إِلَيَّ بِأَخَرَةَ أَنَّ رِجَالًا يُرِيدُونَ بِهِ مَا عِنْدَ النَّاسِ، فَأَرِيدُوا اللَّهَ بِقِرَاءَتِكُمْ وَأَعْمَالِكُمْ» .

**١٧١** - باوكى فراس دەڵێت عومەرى كوڕى الخطاب رضي الله عنه ووتارى بۆ داين جا فەرمووى : ئەى خەڵكينە بێگومان ئێوەمان دەناسى كاتێك كە پێغەمبەرى خوا ﷺ لەناوماندا بوو وەحى دادەبەزى بەسەريدا، الله تعالى هەواڵى ئێوەى پێ رادەگەياندين، بەڵام بێگومان پێغەمبەرى خوا ﷺ مرد و وەحى پچڕا، وە بێگومان ئێستا دەتانناسين بەوەى كەوا پێتان دەڵێم ئەو كەسەى چاكە دەربخات لە ئێوە ئێمەش گومانى باشى پێدەبەين .

وە ئەو كەسەى خراپە دەربخات لە ئێوە گومانى خراپى پێدەبەين وە نهێنييەكانتان لە نێوان خۆتان و پەروەردگارتانە .

**١٧٢** - حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، أَخْبَرَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، أَخْبَرَنَا سَعِيدٌ الْجُرَيْرِيُّ، بِإِسْنَادِهِ مِثْلَهُ .

**١٧٢** - سعيدى جريرى دەيگێڕێتەوە بە هەمان شێوەى پێشوو .

**١٧٣** - حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ عَبْدِ الْأَعْلَى قَالَ: حَدَّثَنَا بَقِيَّةُ، عَنْ شُعْبَةَ، عَنِ الْجُرَيْرِيِّ، عَنْ أَبِي نَضْرَةَ، عَنْ أَبِي فِرَاسٍ عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ قَالَ: «لَقَدْ أَتَى عَلَيْنَا حِينٌ وَزَمَانٌ، وَمَا نَرَى أَنَّ أَحَدًا يَتَعَلَّمُ الْقُرْآنَ يُرِيدُ بِهِ إِلَّا اللَّهَ عز وجل، فَلَمَّا كَانَ هَاهُنَا بِأَخَرَةَ حَسِبْتُ، أَنَّ رِجَالًا يَتَعَلَّمُونَ يُرِيدُونَ النَّاسَ وَمَا عِنْدَهُمْ، فَأَرِيدُوا اللَّهَ بِقِرَاءَتِكُمْ وَأَعْمَالِكُمْ، فَإِنَّا كُنَّا نَعْرِفُكُمْ إِذْ فِينَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وَإِذْ يَنْزِلُ إِلَيْنَا الْوَحْيُ، وَيُنَبِّئُنَا اللَّهُ مِنْ أَخْبَارِكُمْ، فَأَمَّا الْيَوْمَ

فَقَدْ مَضَــى رَسُــولُ اللَّهِ ﷺ، وَانْقَطَعَ الْوَحْيُ، وَإِنَّمَا أَعْرِفُكُمْ بِمَا أَقُولُ: مَنْ أَعْلَنَ لَنَا خَيْرًا أَحْبَبْنَاهُ عَلَيْهِ وَظَنَنَّا بِهِ خَيْرًا .

وَمَنْ أَظْهَرَ لَنَا شَرًّا بَغِضْنَاهُ عَلَيْهِ وَظَنَنَّا بِهِ شَرًّا، سَرَائِرُكُمْ فِيمَا بَيْنَكُمْ وَبَيْنَ رَبِّكُمْ» .

**١٧٣** - باوكى فراس دەگێڕێتەوە لە عمر ـــى كوڕى الخطاب رضي الله عنه فەرمووى : بێگومـان كـات و ســەردەمێكـمـان بەســەردا ڕۆيشــتووە، نەمانزانيوە كەوا كەسـێك فێرى قورئان ببێت مەبەسـتى كەســێك بێت جگە لە الله تعالى، بەڵام لەم كـاتەى ئێســتـا بەدواوە هەســتم كردووە كەوا كەســانێك خۆيـان فێرى قورئـان خوێنـدن دەكـەن مەبەستيان پێ خەڵكە و ئەوەى لە لايانە، جا ئاگاداربن نيەتتان تەنها بۆ الله تعالى بێت لە قورئان خوێندنەوەتان و كـارو كـردەوەتـان، بێگومان ئێوەمان دەناســى كـاتێك كە پێغەمبەرى خوا ﷺ لەناوماندا بوو و وەحى دادەبەزى بەســەريدا الله تعالى هەواڵى ئێوەى پێ ڕادەگەياندين بەڵام بێگومان پێغەمبەرى خوا ﷺ مرد و وەحى پچڕا، وە بێگومان ئێســتـا دەتانناســين بەوەى كەوا پێتان دەڵێم : ئەو كەســەى چاكە دەربخات لە ئێوە خۆشمان دەوێت لەسەر ئەوە وە گومانى باشى پێدەبەين .

وە ئەو كەسەى خراپە دەربخات لە ئێوە ڕقمان لێى دەبێتەوە لەسەر ئەوە وە گومـانى خراپى پێـدەبەين وە نهێنييەكـانتـان لە نێوان خۆتـان و پەروەردگارتانە .

١٧٤ - حَدَّثَنَا وَهْبُ بْنُ بَقِيَّةَ، حَدَّثَنَا خَالِدٌ، عَنْ حُمَيْدٍ الْأَعْرَجِ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ الْمُنْكَدِرِ عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: خَرَجَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَنَحْنُ نَقْرَأُ الْقُرْآنَ، وَفِينَا الْعَجَمِيُّ وَالْعَرَبِيُّ قَالَ: فَوَقَفَ عَلَيْنَا يَسْتَمِعُ فَقَالَ: «اقْرَءُوا وَكُلٌّ حَسَنٌ، سَيَجِيءُ أَقْوَامٌ يُقِيمُونَهُ، كَمَا تُقَامُ الْقِدَحُ يَتَعَجَّلُونَهُ، وَلَا يَتَأَجَّلُونَهُ».

١٧٤ - جابری کوڕی عبد الله رضـي الله عنهما دەفەرمووێ رسـول الله ﷺ هاتە لامان وە ئێمە قورئانمان دەخوێندەوە وە جگە لە عەرەب و عەرەبمان تێدا بوو فەرمووی جا ڕاوەستا لامان گوێی گرتبوو جا فەرمووی : (بیخوێننەوە وە هەمووتان بە جوانی و ڕێك و پێكی دەیخوێننەوە، وە لە دوای ئێوە خەڵكانێك دێن زۆر پێداگرن **[لەسەر دقیق خوێندنەوەی قورئان]** وەك تیژكردنەوەی تیر پەلەی لێدەكەن **[واتە بۆ مەبەستی ناوبانگ وبەدەستهێنانی دونیا دەیخوێننەوە]** وە دوای ناخەن **[واتە مەبەستیان پاداشتی قیامەت نییە والله اعلم]** ) .

١٧٥ - حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ لَهِيعَةَ، عَنْ بَكْرِ بْنِ سَوَادَةَ، عَنْ أَبِي حَمْزَةَ الْخَوْلَانِيِّ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: خَرَجَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَوْمًا، وَنَحْنُ نَفْتَرِي، فَقَالَ: «إِنَّ فِيكُمْ خَيْرًا، مِنْكُمْ رَسُولُ اللَّهِ، وَتَقْرَءُونَ كِتَابَ اللَّهِ مِنْكُمُ الْأَبْيَضُ وَالْأَسْوَدُ، وَالْأَعْجَمِيُّ وَالْعَرَبِيُّ، وَسَيَأْتِي عَلَى النَّاسِ زَمَانٌ يَقْرَءُونَ الْقُرْآنَ يَثْقَفُونَهُ كَمَا يُثْقَفُ الْقَدَحُ، لَا يُجَاوِزُ تَرَاقِيَهُمْ، يَتَعَجَّلُونَ أُجُورَهُمْ، وَلَا يَتَأَجَّلُونَهُ».

**١٧٥** - لە أنس كوڕی مالك ــەوە رضي الله عنه دەفەرمووێ رسـول الله ﷺ ڕۆژێك هاتە لامان وە ئێمە قورئانمان دەخوێندەوە بۆ یەكتری جا فەرمووی : (بەڕاسـتی ئێوە خێرتان لەناودایە، رسـول الله ﷺ لەناوتاندایە وە كـتابی الله تعالی دەخوێننەوە ڕەش و سـپی عەرەب و غەیرە عەرەبتان تێدایە وە سـەردەمێك دادێت بەسـەر خەڵكی قورئـان دەخوێننەوە دەسكاری دەكەن هەروەكو چۆن دەسكاری تیر دەكەن **[تیژوڕاستی دەكەنەوە تا بەكاریبێنن، ئەوانیش كە دەسـكاری قورئان ئەكەن تا بەپێی ویسـتی خۆیـان بەكـاریبێنن]**، لە گەردنیـان تێنـاپەڕێ پەلە دەكەن لە پاداشتەكەی وە دوای ناخەن) .

**١٧٦** - حَدَّثَنَا أَبُو قُدَامَةَ عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ سَعِيدٍ، أَخْبَرَنَا أَبُو يَحْيَى إِسْحَاقُ بْنُ سُـلَيْمَانَ الرَّازِيُّ قَالَ: سَـمِعْتُ مُوسَـى بْنَ عُبَيْدَةَ،... يَذْكُرُ، عَنْ أَخِيهِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُبَيْدَةَ، عَنْ سَـهْلِ بْنِ سَـعْدٍ الْأَنْصَـارِيِّ قَالَ: خَرَجَ عَلَيْنَا رَسُـولُ اللَّهِ ﷺ، وَنَحْنُ نَقْتَرِي وَيَقْرِي بَعْضُـنَا بَعْضًـا، فَقَالَ: «**الْحَمْدُ لِلَّهِ، كِتَابُ اللَّهِ وَاحِدٌ، فِيكُمُ الْأَخْيَارُ، فِيكُمُ الْأَحْمَرُ وَالْأَسْوَدُ، اقْرَءُوا اقْرَءُوا اقْرَءُوا قَبْلَ أَنْ يَجِيءَ أَقْوَامٌ يُقِيمُونَهُ كَمَا يُقَامُ الْقَدَحُ لَا يُجَاوِزُ تَرَاقِيَهُمْ يَتَعَجَّلُونَ أَجْرَهُ، وَلَا يَأْجَلُونَهُ**» .

**١٧٦** - سـهلی كوڕی سـعد الأنصـاري دەفەرمووێ : ڕۆژێك رسـول الله ﷺ هـات بۆ لامان وە ئێمە قورئـانمان دە خوێندەوە و هەندێكمان قورئان بۆ هەندێكمان دەخوێندەوە جا فەرمووی : (سـوپاس و سـتایش بۆ الله تعـالی، كـتـابی الله یەكە، لەنـاوتـانـدایە بـاشـترینەكـان، لە

ناوتاندایه سوور و سپی، بیخوێننەوە بیخوێننەوە بیخوێننەوە پێش ئەوەی کەسانێك بێت کە زۆر پێداگرن [لەسەردەقیق خوێندنەوەی قورئان] وەك تیژکردنەوەی تیر پەلەی لێدەکەن [واتە بۆ مەبەستی ناوبانگ و بەدەستهێنانی دونیا دەیخوێننەوە]، لە گەردنیان تێناپەڕێ داوای پاداشتەکەی دەکەن لە دونیا ڕاستەوخۆ، وە دوای ناخەن) .

١٧٧ - حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْحَسَنِ الْبَلْخِيُّ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ الْمُبَارَكِ قَالَ: أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ... عَنْ يَحْيَى بْنِ الْمُخْتَارِ، عَنِ الْحَسَنِ قَالَ: «إِنَّ هَذَا لَقُرْآنٌ قَدْ قَرَأَهُ عَبِيدٌ وَصِبْيَانٌ لَا عِلْمَ لَهُمْ بِتَأْوِيلِهِ، وَلَمْ يَأْتُوا الْأَمْرَ مِنْ قِبَلِ أَوَّلِهِ .

قَالَ اللَّهُ عز وجل: ﴿كِتَابٌ أَنْزَلْنَاهُ إِلَيْكَ مُبَارَكٌ لِيَدَّبَّرُوا آيَاتِهِ﴾ [ص: ٢٩].

وَمَا يَتَدَبَّرُ آيَاتِهِ إِلَّا اتِّبَاعَهُ بِعِلْمِهِ، وَاللَّهُ يَعْلَمُهُ، أَمَا وَاللَّهِ مَا هُوَ بِحِفْظِ حُرُوفِهِ، وَإِضَاعَةِ حُدُودِهِ، حَتَّى أَنَّ أَحَدَهُمْ لَيَقُولُ قَدْ قَرَأْتُ الْقُرْآنَ كُلَّهُ فَمَا أُسْقِطُ مِنْهُ حَرْفًا، وَقَدْ أَسْقَطَهُ وَاللَّهِ كُلَّهُ مَا بَدَا لَهُ الْقُرْآنُ فِي خُلُقٍ وَلَا عَمَلٍ، حَتَّى أَنَّ أَحَدَهُمْ لَيَقُولُ: وَاللَّهِ إِنِّي لَأَقْرَأُ السُّورَةَ، وَاللَّهِ مَا هَؤُلَاءِ بِالْقُرَّاءِ، وَلَا الْعُلَمَاءِ، وَلَا الْحُكَمَاءِ، وَلَا الْوَرَعَةِ، وَمَتَى كَانَتِ الْقُرَّاءُ تَقُولُ مِثْلَ هَذَا إِلَّا أَكْثَرَ اللَّهُ فِي النَّاسِ مِثْلَ هَذَا» .

١٧٧ - حسن البصري دەڵێت : (بەڕاستی ئەم قورئانە کۆیلە و منداڵەکان خوێندیانەوە کە هیچ زانستێکیان نییە بە تەفسیرەکەی،

وە ڕێگایەکیان نەگرتەبەر بۆ ئەوەی زانســـت بەدەســـت بهێنن دەربارەی تەفسیرەکەی .

الله تعالی دەفەرمووێ : ﴿كِتَابٌ أَنْزَلْنَاهُ إِلَيْكَ مُبَارَكٌ لِيَدَّبَّرُوا آيَاتِهِ﴾ [ص: ٢٩] .

وە تەدەبوور ناکرێ لە ئایەتەکانی تەنها بە شـوێنکەوتنی نەبێ بە زانستەوە، والله تعالی زانایە پێی، بەڵام سوێند بە الله تعالی بە لەبەرکردنی پیتەکانی نییە، وە سنوورەکانی ببەزێندرێ، هەتاوەکو کەوا یەکێك لەوان دەڵێت بێگومان قورئانم خوێندۆتەوە هەمووی بێ ئەوەی یەك پیتی تێبپەڕێنم، بێگومان سـوێند بە الله تعالی پەڕاندوویەتی [وازیلێهێناوە] ئەوەی قورئان فەرمانی پێکردووە لە ڕەوشـــت و کاروکردەوە، هەتا لەوان هەیە دەڵێت : سوێند بە الله تعالی من قورئان دەخوێنمەوە، سوێند بە الله ئەوان قورئان خوێن نین، وە زانا و دانا و خاوەن وەرعیش نین، وە هەر کاتێکیش قورئان خوێنەکان هاوشێوەی ئەو قسانە بکەن ئیللا الله تعالی نموونەی ئەوانە لەناو خەڵکی زیاد دەکات .

١٧٨ - أَخْبَرَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ الْمُبَارَكِ قَالَ: أَخْبَرَنِي عُمَرُ، عَنْ يَحْيَى بْنِ الْمُخْتَارِ، عَنِ الْحَسَنِ، فَذَكَرَ مِثْلَهُ .

١٧٨ - لە حسن البصري بەهەمان شێوەی پێشوو .

١٧٩ - حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْحَسَنِ الْبَلْخِيُّ قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ الْمُبَارَكِ، أَخْبَرَنَا يَحْيَى بْنُ أَيُّوبَ، عَنْ عَمْرِو بْنِ الْحَارِثِ، عَنْ بَكْرِ بْنِ سَوَادَةَ، عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ قَالَ: «إِذَا حَلَّيْتُمْ مَصَاحِفَكُمْ، وَزَوَّقْتُمْ مَسَاجِدَكُمْ، فَالدَّمَارُ عَلَيْكُمْ».

١٧٩ - له أبو درداء رضي الله عنه دەفەرمووێ : هەر کاتێك موصحەفەکانتان ڕازاندەوە، وە مزگەوتەکانتان ڕازاندەوە ئەوا [لەناوچوون لەسەرتانە والله اعلم].

١٨٠ - حَدَّثَنَا أَبُو السَّعُودِ أَحْمَدُ بْنُ الْفُرَاتِ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يَزِيدَ قَالَ: ثنا حَيْوَةُ بْنُ شُرَيْحٍ، عَنْ بَشِيرِ بْنِ أَبِي عَمْرٍو أَنَّ الْوَلِيدَ بْنَ قَيْسٍ أَخْبَرَهُ أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا سَعِيدٍ الْخُدْرِيَّ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «سَيَكُونُ خَلْفٌ بَعْدَ تِسْعِينَ سَنَةً أَضَاعُوا الصَّلَاةَ وَاتَّبَعُوا الشَّهَوَاتِ، ثُمَّ يَكُونُ خَلْفٌ يَقْرَءُونَ الْقُرْآنَ لَا يَعْدُو تَرَاقِيَهُمْ».

١٨٠ - له أبو سعيد الخدري رضي الله عنه دەفەرمووێ : رسول الله ﷺ فەرمووی : (دوای نەوەد ساڵ کۆمەڵێك دێن نوێژەکانیان بە هەدەر دەدەن و شوێن هەواو ئارەزووەکانیان دەکەون، پاشان کەسانێك دێن قورئان دەخوێننەوە لە گەردنیان تێناپەڕێت).

١٨١ - حَدَّثَنَا هُدْبَةُ بْنُ خَالِدٍ... قَالَ: حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ الْمُغِيرَةِ، عَنْ حُمَيْدِ بْنِ هِلَالٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الصَّامِتِ، عَنْ أَبِي ذَرٍّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ

ﷺ: «إِنَّ بَعْدِي قَوْمًا مِنْ أُمَّتِي يَقْرَءُونَ الْقُرْآنَ لَا يُجَاوِزُ حَلَاقِيمَهُمْ، يَخْرُجُونَ مِنَ الدِّينِ كَمَا يَخْرُجُ السَّهْمُ مِنَ الرَّمِيَّةِ هُمْ شَرُّ الْخَلْقِ وَالْخَلِيقَةِ».

قَالَ سُلَيْمَانُ: أُرَاهُ قَالَ: سِيمَاهُمُ التَّحْلِيقُ، فَلَقِيتُ رَافِعَ بْنَ عَمْرٍو أَبَا الْحَكَمِ الْغِفَارِيَّ قَالَ: وَأَنَا أَيْضًا قَدْ سَمِعْتُهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ.

١٨١ - له أبو ذرة ـــەوه رضي الله عنه دەفەرمووێ: رسـول الله ﷺ فەرمووی: (بەڕاستی له دوای من کەسانێك دێن قورئان دەخوێننەوه له گەردنیان تێناپەڕێت، له دین دەردەچن وەکو چۆن تیر لەوه دەردەچێت کە ئاڕاستەی دەکرێت، ئەوانە خراپترینی خەڵکین).

سلیمان دەڵێت: وای دەبینم فەرمووی: نیشانەیان سەرتاشینە، جا گەیشـتم بە رافع ـــی کوڕی عمرو أبا الحکم الغفاري، وتی: وه منیش بەهەمان شێوه بیستوومە له رسول الله ﷺ.

١٨٢ - حَدَّثَنَا أَبُو بَكْرِ بْنُ أَبِي شَيْبَةَ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ، عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ الْمُغِيرَةِ، عَنْ حُمَيْدِ بْنِ هِلَالٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الصَّامِتِ، عَنْ أَبِي ذَرٍّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «سَيَكُونُ بَعْدِي مِنْ أُمَّتِي قَوْمٌ يَقْرَءُونَ الْقُرْآنَ فَلَا يُجَاوِزُ حُلُوقَهُمْ» فَذَكَرَ فِعْلَهُ.

١٨٢ - له أبو ذرة ـــەوه رضي الله عنه دەفەرمووێ: رسـول الله ﷺ فەرمووی: (بەڕاستی له دوای من کەسانێك دێن قورئان دەخوێننەوه له گەردنیان تێناپەڕێت)، جا باسی کرد.

**١٨٣** - حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى، نا عَبْدُ الْوَهَّابِ قَالَ: سَمِعْتُ يَحْيَى بْنَ سَعِيدٍ يَقُولُ: أَخْبَرَنِي أَبُو الزُّبَيْرِ أَنَّهُ سَمِعَ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ يَقُولُ: "بَصُرَ عَيْنِي، وَسَمِعَ أُذُنِي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ بِالْجِعْرَانَةِ.

وَفِي ثَوْبِ بِلَالٍ فِضَّةٌ، وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَقْسِمُهَا بَيْنَ النَّاسِ يُعْطِيهِمْ .

قَالَ لَهُ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ اعْدِلْ .

قَالَ: «وَيْلَكَ، وَمَنْ يَعْدِلُ إِذَا لَمْ أَعْدِلْ؟، لَقَدْ خِبْتُ، وَخَسِرْتُ إِنْ لَمْ أَعْدِلْ» .

قَالَ عُمَرُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ دَعْنِي فَلْأَقْتُلْ هَذَا الْمُنَافِقَ الْخَبِيثَ .

فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَعَاذَ اللَّهِ أَنْ يُحَدِّثَ النَّاسُ إِنِّي أُقْتَلُ أَصْحَابِي، إِنَّ هَذَا وَأَصْحَابَهُ يَقْرَءُونَ الْقُرْآنَ لَا يُجَاوِزُ حُلُوقَهُمْ، أَوْ حَنَاجِرَهُمْ، يَمْرُقُونَ مِنَ الدِّينِ كَمَا يَمْرُقُ السَّهْمُ مِنَ الرَّمِيَّةِ» .

**١٨٣** - جابر ی کوڕی عبد الله رضي الله عنه دەفەرمووێ : چاوەکانم بینیان، وە گوێکانم بیستیان لە رسول الله ﷺ لە جعرانە .

لە ناو جلی بیلال رضي الله عنه زیو هەبوو رسول الله ﷺ دابەشی دەکرد لە نێوان خەڵکی پێی دەبەخشین .

جا پیاوێك پێی وت : ئەی رسول الله ﷺ دادپەروەربە .

فەرمووی : (هاوار بۆتۆ کێ دادپەروەرە ئەگەر من دادپەروەر نەبم؟ بێگومان تیاچووم و خەسارەتمەند بووم ئەگەر دادپەروەر نەبم؟) .

ئيمامى عمر رضـي الله عنه فەرمووى : ئەى رســول الله ﷺ وازم لێبێنە ئەو مونافیقە پیسە بکوژم .

جا رســول الله ﷺ فەرمووى : (پەنا بە الله دوايى خەڵكى بلێن من هاوەڵەكانم دەكوژم بەڕاستى ئەوە و هاوەڵەكانى قورئان دەخوێننەوە لە قورگ و گەردنيان تێناپەڕێت لە دين دەردەچن وەكو چۆن تير لەوە دەردەچێت كە ئاڕاستەى دەكرێت) .

**١٨٤** - حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ مُوسَى الْأَنْصَارِيُّ، ثنا أَنَسُ بْنُ عِيَاضٍ قَالَ: ثنا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، أَخْبَرَنِي أَبُو الزُّبَيْرِ الْمَكِّيُّ قَالَ: سَمِعْتُ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ السُّلَمِيَّ يَقُولُ: سَمِعَتْ أُذُنَايَ، وَأَبْصَرَتْ، عَيْنَايَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ بِالْجِعْرَانَةِ، وَفِي ثَوْبِ بِلَالٍ فِضَّةٌ، وَرَسُولُ اللَّهِ يَقْسِمُهَا لِلنَّاسِ يُعْطِيهِمْ .

فَقَالَ لَهُ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ اعْدِلْ .

قَالَ: «وَيْلَكَ، وَمَنْ يَعْدِلُ إِذَا لَمْ أَعْدِلْ؟، لَقَدْ خِبْتُ إِنْ لَمْ أَكُنْ أَعْدِلُ».

فَقَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ: يَا رَسُولَ اللَّهِ دَعْنِي، فَلْأَقْتُلْ هَذَا الْمُنَافِقَ الْخَبِيثَ .

فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَنْ يَتَحَدَّثَ النَّاسُ أَنِّي أُقْتَلُ أَصْحَابِي، إِنَّ هَذَا وَأَصْحَابَهُ يَقْرَءُونَ الْقُرْآنَ لَا يَتَجَاوَزُ تَرَاقِيَهُمْ، أَوْ حُلُوقَهُمْ، يَمْرُقُونَ مِنَ الدِّينِ، كَمَا يَمْرُقُ السَّهْمُ مِنَ الرَّمِيَّةِ» .

**١٨٤** - جابر ـی كوڕی عبد الله السلمي رضي الله عنهما دەفەرمووێ : چاوەكانم بینیان، وە گوێكانم بیستیان رسول الله ﷺ لە جعرانە وە لەناو جلی بیلال رضي الله عنه زیو هەبوو رسول الله ﷺ دابەشی دەكرد لە نێوان خەڵكی پێی دەبەخشین .

جا پیاوێك پێی وت : ئەی رسول الله ﷺ دادپەروەربە .

فەرمووی : (هاوار بۆ تۆ كێ دادپەروەرە ئەگەر من دادپەروەر نەبم ؟

بێگومان خەسارەتمەند بووم ئەگەر دادپەروەر نەبم؟)

جا ئیمامی عمر ـی كوڕی خطاب رضي الله عنه فەرمووی : ئەی رسول الله ﷺ وازم لێبێنە ئەو مونافیقە پیسە بكوژم .

جا رسول الله ﷺ فەرمووی : (با خەڵكی نەڵێن من هاوەڵەكانم دەكوژم، بەڕاستی ئەوە و هاوەڵەكانی قورئان دەخوێننەوە لە قوڕگ و گەردنیان تێناپەڕێت لە دین دەردەچن وەكو چۆن تیر لەوە دەردەچێت كە ئاڕاستەی دەكرێت) .

**١٨٥** - حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ مُعَاذٍ، ثنا أَبِي قَالَ: حَدَّثَنَا قُرَّةُ بْنُ خَالِدٍ، عَنِ الزُّبَيْرِ، عَنْ جَابِرٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ أَقْوَامًا يَجِيئُونَ يَقْرَءُونَ الْقُرْآنَ، لَا يُجَاوِزُ تَرَاقِيَهُمْ يَمْرُقُونَ مِنَ الدِّينِ كَمَا يَمْرُقُ السَّهْمُ مِنَ الرَّمِيَّةِ، لَا يَعُودُونَ إِلَيْهِ حَتَّى يَرْتَدَّ السَّهْمُ عَلَى فُوقِهِ» .

**١٨٥** - جابر رضـي الله عنه دەفەرموێت : رسـول الله ﷺ فەرمووی : (بێگومان کەسانێك دێن قورئان دەخوێننەوە لە گەردنیان تێناپەڕێت لە دین دەردەچن وەکو چۆن تیر لەوە دەردەچێت کە ئاراسـتەی دەکرێت، پاشان ناگەڕێنەوە بۆی هەتاوەکو بەسەرخۆیەوە هەڵدەگەڕێتەوە) .

**١٨٦** - حَدَّثَنَا أَبُو بَكْرِ بْنُ أَبِي شَـيْبَةَ قَالَ: ثنا زَيْدُ بْنُ الْحُبَابِ قَالَ: نا قُرَّةُ بْنُ خَالِدٍ السَّـدُوسِيُّ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو الزُّبَيْرِ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ أَنَّ رَسُـولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَقْسِـمُ مَغَانِمَ حُنَيْنٍ. . .، فَوَقَفَ عَلَيْهِ رَجُلٌ، فَقَالَ: اعْدِلْ.

قَالَ: «لَقَدْ شَقِيتُ إِنْ لَمْ أَعْدِلْ» يَعْنِي نَفْسَهُ .

فَقَالَ رَسُـولُ اللَّهِ ﷺ: «يَجِيءُ قَوْمٌ يَقْرَءُونَ الْقُرْآنَ لَا يُجَاوِزُ تَرَاقِيَهُمْ، يَمْرُقُونَ مِنَ الدِّينِ كَمَا يَمْرُقُ السَّهْمُ مِنَ الرَّمِيَّةِ» .

**١٨٦** - لە جابر ــی کوڕی عبد الله رضي الله عنه کەوا رسول الله ﷺ غەنیمەی جەنگی حونەینی دابەش دەکرد جا پیاوێك لای ڕاوەسـتا و وتی دادپەروەربە .

فەرمووی : (بەڕاستی تیاچووم ئەگەر دادپەروەر نەبم) واتە نەفسی خۆی .

جا رسول الله ﷺ فەرمووی : (كەسانێك دێن قورئان دەخوێننەوە لە گەردنیان تێناپەڕێت لە دین دەردەچن وەكو چۆن تیر لەوە دەردەچێت كە ئاراستەی دەكرێت) .

١٨٧ - حَدَّثَنَا أَبُو بَكْرِ بْنُ أَبِي شَيْبَةَ، حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ مُسْهِرٍ، عَنِ الشَّيْبَانِيِّ، عَنْ يُسَيْرِ بْنِ عَمْرٍو قَالَ: سَأَلْتُ سَهْلَ بْنَ حُنَيْفٍ: هَلْ سَمِعْتَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَذْكُرُ هَؤُلَاءِ الْخَوَارِجَ؟

قَالَ: «سَمِعْتُهُ، وَأَشَارَ بِيَدِهِ نَحْوَ الْمَشْرِقِ، وَيَخْرُجُ مِنْهُمْ قَوْمٌ يَقْرَءُونَ الْقُرْآنَ بِأَلْسِنَتِهِمْ لَا يَعْدُو تَرَاقِيَهُمْ، يَمْرُقُونَ مِنَ الدِّينِ كَمَا يَمْرُقُ السَّهْمُ مِنَ الرَّمِيَّةِ» .

١٨٧ - یسیری كوڕی عمرو دەڵێت : پرسیارم كرد لە سهلی كوڕی حنیف : ئایا بیستووتە لە رسول الله ﷺ باسی ئەو خەواریجانە بكات؟

وتی : بیستوومە وە ئاماژەی كرد بە دەستی بۆ ڕۆژهەڵات وە كۆمەڵێك دەردەچێت لێیان قورئان دەخوێننەوە بە زمانیان لە گەردنیان تێناپەڕێت لە دین دەردەچن وەكو چۆن تیر لە كەوان دەردەچێت) .

١٨٨ - حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، حَدَّثَنَا ابْنُ لَهِيعَةَ، عَنِ الْمُغِيرَةِ، عَنْ أَبِي قَيْسٍ مَالِكِ بْنِ الْحَكَمِ عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ غَنْمٍ الْأَشْعَرِيِّ، أَنَّهُ قَدِمَ مِصْرَ مَعَ

مَرْوَانَ بْنِ الْحَكَمِ، وَكَانَ يُحَدِّثُهُمْ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ كَتَبَ إِلَى أُمَرَاءِ الْأَجْنَادِ، أَنْ يَبْعَثُوا إِلَيْهِ قُرَّاءَهُمْ وَأُمَرَاءَهُمْ إِذَا بَلَغُوا ذَا الْمَرْوَةِ أَنْ يُحْشَرَ أَوَّلُهُمْ عَلَى آخِرِهُمْ، حَتَّى يُلْطَوْا جَمِيعًا .

قَالَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ غَنْمٍ: فَلَمَّا بَلَغْنَا ذَا الْمَرْوَةِ مَكَثْنَا حَتَّى اجْتَمَعَا، فَلَمَّا دَخَلْنَا أُخْبِرَ عُمَرُ بِنَا، فَأَتَيْنَاهُ .

فَقَالَ: اكْشِفُوا رُءُوسَكُمْ، فَكَشَفُوا يَوْمَئِذٍ، فَمِنَّا ذُو الضَّفِيرَتَيْنِ، وَالْغَدِيرَتَيْنِ، وَمِنَّا ذُو الْجُمَّةِ وَالْمَوْفُورُ وَالْمَحْلُوقُ .

فَقَالَ: أَمَا وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، وَلَوْ وَجَدْتُكُمْ مُحَلِّقِينَ لَفَعَلْتُ بِكُمْ فَعْلَةً سَمِعَ بِكُمُ الْأَجْنَادُ .

فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «يَخْرُجُ نَاسٌ مِنْ أُمَّتِي يَقْرَءُونَ الْقُرْآنَ يَمْرُقُونَ مِنَ الدِّينِ كَمَا يَمْرُقُ السَّهْمُ مِنَ الرَّمِيَّةِ، وَأَمَارَةُ ذَلِكَ أَنَّهُمْ مُحَلِّقُونَ» .

ثُمَّ أَمَرَ بِنَا، فَفُرِّقْنَا فِي الْمَدِينَةِ .

**١٨٨** - له عبد الرحمن كوڕی غنم الأشعري ـەوە كەوا ئەو چوو بۆ میصر لەگەڵ مروانی كوڕی الحكم هەواڵی پێدان كەوا عمرـی كوڕی الخطاب رضي الله عنه نووسی بۆ ئەمیری سەربازەكان كەوا ئەمیر و قورئان خوێنەكان بنێرن بۆ لای كاتێك گەیشتنە المروة سەرەتایان هەتاوەكو كۆتایان كۆببنەوە هەتا هەموویان بەیەكەوە دەلكێن .

عبد الرحمن كوڕی غنم دەڵێت : كاتێك گەیشتینە ذا المروة ماینەوە هەتاوەكو كۆبووینەوە جا كاتێك چووینە ژوورەوە هەواڵدرا بە عمر ى كوڕی الخطاب رضي الله عنه لەبارەمانەوە جا هات بۆ لامان .

جا فەرمووی : سەرتان نیشان بدەن سەریان نیشاندا جا تێمان دابوو پرچی دوو تاڵ بوو **[كە بە توندی بەیەكەوە لكێنراوە]**، هەبوو پرچی تاڵێ بوو **[بە هەردوو لای سەرەوە هەڵواسراوە بەبێ ئەوەی لێك بئاڵێت]** پرچی چڕو پڕ بوو هەبوو پرچی درێژ بوو تا نەرمایی گوێی هاتبوو هەبوو سەری تاشراو بوو .

جا فەرمووی : سوێند بەوكەسەی نەفسی منی بەدەستە ئەگەر ئێوەم بینیبا سەرتان تاشیوە **[سفركردووە والله اعلم]** كارێكم پێدەكردن سەربازەكان بیانبیستبا چونكە بەڕاستی من بیستم رسول الله ﷺ فەرمووی : (خەڵكانێك دەردەچن لە ئوممەتەكەم قورئان دەخوێننەوە دەردەچن لە دین وەكو چۆن تیر لەوە دەردەچێت كە ئاڕاستەی دەكرێت، وە نیشانەی ئەوان سەرتاشینە) .

پاشان فەرمانی پێكردین جا لە شاری مدینة بڵاوەمان كرد .

**١٨٩** - حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ عِيسَى الْمِصْرِيُّ، نا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ وَهْبٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي يُونُسُ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبُو سَلَمَةَ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، أَنَّ أَبَا سَعِيدٍ الْخُدْرِيَّ قَالَ: بَيْنَمَا نَحْنُ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَهُوَ يَقْسِمُ قَسْمًا، أَتَاهُ ذُو الْخُوَيْصِرَةِ، وَهُوَ رَجُلٌ مِنْ بَنِي تَمِيمٍ .

فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ اعْدِلْ .

فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «وَيْلَكَ وَمَنْ يَعْدِلُ إِذَا لَمْ أَعْدِلْ» .

قَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ: ائْذَنْ فِيهِ أَضْرِبْ عُنُقَهُ .

فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «دَعْهُ، فَإِنَّ لَهُ أَصْحَابًا يَحْقِرُ أَحَدُكُمْ صَلَاتَهُ مَعَ صَلَاتِهِمْ، وَصِيَامَهُ مَعَ صِيَامِهِمْ، يَقْرَءُونَ الْقُرْآنَ لَا يُجَاوِزُ تَرَاقِيَهُمْ يَمْرُقُونَ مِنَ الْإِسْلَامِ، كَمَا يَمْرُقُ السَّهْمُ مِنَ الرَّمِيَّةِ، يُنْظَرُ إِلَى نَصْلِهِ فَلَا يُوجَدُ فِيهِ شَيْءٌ، ثُمَّ يُنْظَرُ إِلَى رِصَافِهِ فَلَا يُوجَدُ فِيهِ شَيْءٌ، ثُمَّ يُنْظَرُ إِنِّي نَضِيِّهِ فَلَا يُوجَدُ فِيهِ شَيْءٌ، وَهُوَ الْقَدَحُ، ثُمَّ يُنْظَرُ إِلَى قُذَذِهِ فَلَا يُوجَدُ فِيهِ شَيْءٌ سَبَقَ الْفَرْثَ وَالدَّمَ، آيَتُهُمْ رَجُلٌ أَسْوَدُ إِحْدَى عَضُدَيْهِ مِثْلُ الْمَرْأَةِ تَدَرْدَرُ، يَخْرُجُونَ عَلَى فِرْقَةٍ مِنَ النَّاسِ» .

قَالَ أَبُو سَعِيدٍ: فَأَشْهَدُ أَنِّي سَمِعْتُ هَذَا مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَأَشْهَدُ أَنَّ عَلِيَّ بْنَ أَبِي طَالِبٍ قَاتَلَهُمْ؛ فَأَمَرَ بِذَلِكَ الرَّجُلَ فَالْتُمِسَ فَوُجِدَ فَأُتِيَ بِهِ، حَتَّى نَظَرْتُ إِلَيْهِ عَلَى نَعْتِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ الَّذِي نَعَتَ .

**١٨٩** - أبو سعيد الخدري رضي الله عنه دەفەرمووێ : ئێمە لەلای رسول الله بووین ﷺ وە ئەو غەنیمەی دابەش دەکرد ذو الخویصرة کە لە بنی تمیم بوو هات بۆ لای .

جا وتی : ئەی رسول الله ﷺ دادپەروەر بە .

جا رسول الله ﷺ فەرمووی : (هاوار بۆ تۆ ئەی کێ دادپەروەرە؟ ئەگەر من دادپەروەر نەبم) .

عمر ـــــى كوڕى الخطاب رضـــي الله عنه فەرمووى : ڕێگەم بدە لەگەردنی بدەم .

رســـول الله ﷺ فەرمووى : (وازى لێبێنە، چونكە هاوەڵانێكى بۆ پەيا دەبێت يەكێكتان نوێژەكەى بە كەم دەزانێت لە چاو نوێژى ئەوان، وە ڕۆژووەكەى لە چاو ڕۆژووى ئەوان، قورئان دەخوێننەوە لە گەردنيان تێناپەڕێت لە ئيسلام دەردەچن وەكو چۆن تير لەوە دەردەچێت كە ئاڕاســـتەى دەكرێت، ســـەيرى ســـەرە تيرەكەى دەكرێ جا هيچ شـــتێكى تێدا نادۆزرێتەوە، پاشـــان ســـەيرى (رصـــاف) دەكرێ جا هيچى تێدا نادۆزرێتەوە، پاشـــان ســـەيرى ســـەرى تيرەكە دەكرێ هيچى تێدا نابينيەوە، وە ئەوە قدحة پاشـــان ســـەيرى ڕيشـــەكەى [كۆتايى تيرەكە] دەكرێ جا هيچ شـــتێكى تێدا نابينرێ لە خوێن و پيســـايى، نيشـــانەيان پياوێكى ڕەشە لاقۆڵێكى وەكو ئافرەت كە زيادە گۆشتێكى هەبووە لەكـــاتى جوڵە دەجوڵێت، دەردەچن لەكـــاتى نـــاكۆكى لە نێوان خەڵكى) .

أبو سعيد دەفەرموێ : شـايەتى دەدەم من ئەوەم بيستووە لە رسول الله ﷺ، وە شـــايەتى دەدەم كەوا علي كوڕى أبي طالب رضـــي الله عنه جەنگى لەگەڵ كردن جا فەرمانى كرد بە دواى ئەو پياوە بگەڕێن جا دۆزيانەوە و هێنايان بۆى هەتاوەكو سەيرى كرد لەسەر ئەو وەسفەى كە رسول الله ﷺ وەسفى كردبوو .

١٩٠ - حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عُبَيْدِ بْنِ حِسَابٍ قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ ثَوْرٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ قَالَ: بَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَقْسِمُ قَسْمًا إِذْ جَاءَ ابْنُ الْخُوَيْصِرَةِ التَّمِيمِيُّ .

فَقَالَ: اعْدِلْ يَا رَسُولَ اللَّهِ .

قَالَ: «وَيْلَكَ، وَمَنْ يَعْدِلْ إِذَا لَمْ أَعْدِلْ؟» .

قَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ:يَا رَسُولَ اللَّهِ ائْذَنْ لِي فِيهِ فَأَضْرِبْ عُنُقَهُ .

قَالَ: «دَعْهُ، فَإِنَّ لَهُ أَصْحَابًا يَحْقِرُ أَحَدُكُمْ صَلَاتَهُ مَعَ صَلَاتِهِمْ، وَصِيَامَهُ مَعَ صِيَامِهِمْ» .

فَذَكَرَ الْحَدِيثَ .

١٩٠ - لە أبو سعيد الخدري رضي الله عنە دەفەرمووێ : کاتێك رسول الله ﷺ غەنیمەی دابەشدەکرد لەوکاتەدا ذو الخویصرة کە لە بنی تمیم بوو هات بۆ لای .

وتی : ئەی رسول الله ﷺ دادپەروەربە .

جا رسول الله ﷺ فەرمووی : (هاوار بۆ تۆ ئەی کێ دادپەروەرە؟ ئەگەر من دادپەروەر نەبم) .

عمر ی کوڕی الخطاب رضي الله عنە فەرمووی : ئەی رسول الله ﷺ ڕێگەم بدە لەگەردنی بدەم .

رســـول الله ﷺ فەرمووی : (وازی لێبێنە، چونکە هاوەڵانێکی بۆ پەیا دەبێت یەکێکتان نوێژەکەی بە کەم دەزانێت لە چاو نوێژی ئەوان، وە ڕۆژووەکەی لە چاو ڕۆژووی ئەوان) .

جا فەرموودەکەی باسکرد .

**١٩١** - حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ عَزِيزٍ قَالَ: حَدَّثَنِي سَلَامَةُ، عَنْ عُقَيْلٍ، حَدَّثَنِي ابْنُ شِهَابٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبُو سَلَمَةَ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، أَنَّ أَبَا سَعِيدٍ قَالَ: بَيْنَا نَحْنُ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَهُوَ يَقْسِمُ قَسْمًا أَتَاهُ ذُو الْخُوَيْصِرَةِ، وَهُوَ رَجُلٌ مِنْ بَنِي تَمِيمٍ .

ذَكَرَ نَحْوَهُ .

**١٩١** - لە أبو سعيد الخدري رضي الله عنه دەفەرمووێ : ئێمە لەلای رسول الله ﷺ بووین وە ئەو غەنیمەی دابەشدەکرد ذو الخويصرة کە لە بنی تمیم بوو هات بۆ لای .

بەهەمان شێوە گێڕایەوە .

**١٩٢** - حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ مُوسَى قَالَ: ثنا أَنَسُ بْنُ عِيَاضٍ قَالَ يَحْيَى: أَخْبَرَنِي مُحَمَّدُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، وَعَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ، أَنَّهُمَا أَتَيَا أَبَا سَعِيدٍ الْخُدْرِيَّ، فَسَأَلَاهُ عَنِ الْحَرُورِيَّةِ .

فَقَالَا: أَسَمِعْتَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَذْكُرُهَا .

فَقَالَ: لَا أَدْرِي مَا الْحَرُورِيَّةُ .

فَقَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «تَخْرُجُ مِنْ هَذِهِ الْأُمَّةِ» وَلَمْ يَقُلْ مِنْهَا «قَوْمٌ تَحْتَقِرُونَ صَلَاتَكُمْ مَعَ صَلَاتِهِمْ، يَقْرَءُونَ الْقُرْآنَ، لَا يُجَاوِزُ حَنَاجِرَهُمْ، أَوْ حُلُوقَهُمْ يَمْرُقُونَ مِنَ الدِّينِ مُرُوقَ السَّهْمِ مِنَ الرَّمِيَّةِ يَنْظُرُ الرَّجُلُ إِلَى سَهْمِهِ، ثُمَّ إِلَى نَصْلِهِ، ثُمَّ إِلَى رِصَافِهِ، فَيَتَمَارَى فِي الْفُوقِ هَلْ عَلَقَ بِهَا مِنَ الدَّمِ شَيْءٌ؟» .

**١٩٢** - له أبو سلمة و عطاءی کوڕی یسارەوە : کەوا هەردووکیان هاتنە لای أبو سعيد الخدري رضي الله عنه جا پرسیاریان لێکرد سەبارەت بە حەڕوورییەکان .

وتیان : ئایا هیچت بیستووە لە پێغەمبەر دەربارەیان؟

فەرمووی : نازانم حرووریە کێن .

فەرمووی : بیستم پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : (لەناو ئەو ئوممەتە دەردەچێت) وە نەیفەرموو لەناویاندایە (کۆمەڵێك نوێژەکانی خۆتان بە کەم دەبینن لەچاو نوێژی ئەوان، قورئان دەخوێننەوە بەڵام لە گەردنیان یان لە قوڕگیان تێپەڕ ناکات، لە دین دەردەچن وەکو چۆن تیر لەوە دەردەچێت کە ئاڕاستەی دەکرێت، جا تیرهاوێژەکە لە تیرەکەی دەڕوانێت، پاشان لە نەصل و پاشان لە رصاف و فوقەکەی [بەشی جیاوازی تیرن] بۆ ئەوەی ببینێت ئایا هیچ خوێنێکی پێوە نووساوە) .

**١٩٣** - حَدَّثَنَا أَبُو بَكْرِ بْنُ أَبِي شَيْبَةَ قَالَ: حَدَّثَنَا زَيْدُ بْنُ الْحُبَابِ قَالَ: أَخْبَرَنِي مُوسَى بْنُ عُبَيْدَةَ قَالَ: أَخْبَرَنِي عَبْدُ اللَّهِ بْنُ دِينَارٍ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، وَعَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ قَالَا: جِئْنَا أَبَا سَعِيدٍ الْخُدْرِيَّ .

فَقُلْنَا: أَسَمِعْتَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فِي الْحَرُورِيَّةِ؟

قَالَ: مَا أَدْرِي مَا الْحَرُورِيَّةُ، وَلَكِنْ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَذْكُرُ يَقُولُ: «يَأْتِي مِنْ بَعْدِكُمْ أَقْوَامٌ تَحْقِرُونَ صَلَاتَكُمْ مَعَ صَلَاتِهِمْ، وَصِيَامَكُمْ مَعَ صِيَامِهِمْ، وَعِبَادَتَكُمْ مَعَ عِبَادَتِهِمْ، يَقْرَءُونَ الْقُرْآنَ لَا يُجَاوِزُ تَرَاقِيَهُمْ، يَمْرُقُونَ مِنَ الدِّينِ، كَمَا يَمْرُقُ السَّهْمُ مِنَ الرَّمِيَّةِ» .

**١٩٣** - له أبو سلمة و عطاءی کوڕی یسار وتیان : هاتینه لای أبو سعيد الخدري رضي الله عنه .

جا وتمان : ئایا هیچت بیستووه له پێغەمبەرەوە دەربارەی حەڕووریەکان؟

فەرمووی : نازانم حروریة کێن، بەڵام بیستم رسول الله ﷺ باسیکرد و فەرمووی : (لەدوای ئێوە کۆمەڵێك دێن نوێژەکانی خۆتان بەکەم دەبینن لەچاو نوێژی ئەوان وە ڕۆژووتان لە چاو ڕۆژووی ئەوان وە خوا پەرستیتان لە چاو خوا پەرستی ئەوان، قورئان دەخوێننەوە بەڵام لە گەردنیان تێپەڕ ناکات، لە دین دەردەچن وەکو چۆن تیر لەوە دەردەچێت کە ئاڕاستەی دەکرێت) .

**١٩٤** - حَدَّثَنَا مِنْجَابُ بْنُ الْحَارِثِ، وَأَبُو بَكْرِ بْنُ أَبِي شَيْبَةَ قَالَا: حَدَّثَنَا أَبُو الْأَحْوَصِ، عَنْ سِمَاكِ بْنِ حَرْبٍ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَيَقْرَأَنَّ الْقُرْآنَ نَاسٌ مِنْ أُمَّتِي يَمْرُقُونَ مِنَ الْإِسْلَامِ كَمَا يَمْرُقُ السَّهْمُ مِنَ الرَّمِيَّةِ» .

**١٩٤** - لە عبد اللهى كوڕى عباس رضي الله عنهما فەرمووى : رسول الله ﷺ فەرمووى : (خەڵكانێك لە ئوممەتەكەم قورئان دەخوێننەوە لە ئیسلام دەردەچن وەكو چۆن تیر لەوە دەردەچێت كە ئاراستەی دەكرێت) .

**١٩٥** - حَدَّثَنَا أَبُو بَكْرِ بْنُ أَبِي شَيْبَةَ قَالَ: حَدَّثَنَا يُونُسُ بْنُ مُحَمَّدٍ قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ سَلَمَةَ، عَنِ الْأَزْرَقِ بْنِ قَيْسٍ، عَنْ شَرِيكِ بْنِ شِهَابٍ الْحَارِثُ قَالَ: جَعَلْتُ أَتَمَنَّى أَنْ أَلْقَى رَجُلًا مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ يُحَدِّثُنِي عَنِ الْخَوَارِجِ، فَلَقِيتُ أَبَا بَرْزَةَ الْأَسْلَمِيَّ فِي نَفَرٍ مِنْ أَصْحَابِهِ فِي يَوْمِ عَرَفَةَ .

فَقُلْتُ: حَدِّثْنِي بشَيْءٍ سَمِعْتَهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ فِي الْخَوَارِجِ .

قَالَ: أُحَدِّثُكَ بِمَا سَمِعَتْ أُذُنَايَ، وَرَأَتْ عَيْنَايَ: أُتِيَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِدَنَانِيرَ يَقْسِمُهَا، وَعِنْدَهُ رَجُلٌ أَسْوَدُ مَطْمُومُ الشَّعْرِ عَلَيْهِ ثَوْبَانِ أَبْيَضَانِ، بَيْنَ عَيْنَيْهِ أَثَرُ السُّجُودِ، يَتَعَرَّضُ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَلَمْ يُعْطِهِ، فَعَرَضَ لَهُ مِنْ قِبَلِ وَجْهِهِ فَلَمْ يُعْطِهِ، فَأَتَاهُ مِنْ قِبَلِ يَمِينِهِ فَلَمْ يُعْطِهِ شَيْئًا، ثُمَّ أَتَاهُ مِنْ قِبَلِ شِمَالِهِ فَلَمْ يُعْطِهِ شَيْئًا، ثُمَّ أَتَاهُ مِنْ خَلْفِهِ فَلَمْ يُعْطِهِ شَيْئًا .

فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ مَا عَدَلْتَ مُنْذُ الْيَوْمَ فِي الْقِسْمَةِ .

فَغَضِبَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ غَضَبًا شَدِيدًا، ثُمَّ قَالَ: «وَاللَّهِ لَا تَجِدُونَ أَحَدًا أَعْدَلَ عَلَيْكُمْ مِنِّي» ثَلَاثَ مَرَّاتٍ .

ثُمَّ قَالَ: «يَخْرُجُ عَلَيْكُمْ مِنْ قِبَلِ الْمَشْرِقِ رِجَالٌ كَانَ هَذَا مِنْهُمْ، هَدْيُهُمْ كَهَدْيِهِ، يَقْرَءُونَ الْقُرْآنَ لَا يُجَاوِزُ تَرَاقِيَهُمْ، يَمْرُقُونَ مِنَ الدِّينِ كَمَا يَمْرُقُ السَّهْمُ مِنَ الرَّمِيَّةِ، لَا يَعُودُونَ إِلَيْهِ»، وَوَضَعَ يَدَهُ عَلَى صَدْرِهِ، «سِيمَاهُمُ التَّحْلِيقُ، لَا يَزَالُونَ يَخْرُجُونَ حَتَّى يَخْرُجَ آخِرُهُمْ مَعَ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ، فَإِذَا رَأَيْتُمُوهُمْ، فَاقْتُلُوهُمْ بِلِبَاسِ الْخَلْقِ وَالْخَلِيقَةِ»، يَقُولُهَا ثَلَاثًا .

**١٩٥** - شريك ـی كوڕی شهاب ـی حارث دەڵێت : ئاواتم دەخواست کەوا بگەم بە پیاوێك لە هاوەڵانی محمد ﷺ فەرموودەم بۆ بگێڕێتەوە لەبارەی خەواریج، جا گەیشتم بە ئەبا برزەی ئەسلەمی لەناو هەندێك لە هاوەڵانی لە ڕۆژی عەرەفە .

جا وتم شتێکم بۆ بگێڕەوە کە بیستووتە لە رسول الله ﷺ فەرمووبێتی لەبارەی خەواریج .

فەرمووی : بۆت دەگێڕمەوە بەوەی کەوا هەردوو گوێکانم بیستوویانە و چاوەکانم بینیویانە : (هەندێك دینار هێنرا بۆ رسول الله ﷺ جا دابەشی دەکرد وە پیاوێکی ڕەشی پرچ زۆری دوو جلی سپی لەبەر بوو نێوان دوو چاوەکانی شوێن سوجدە دیاربوو خۆی نیشاندا بە رسول الله ﷺ بەڵام پێی نەدا جا خۆی پێنیشاندا لەلای پێشەوەی بەڵام پێی نەدا، جا هات بۆلای لە لای ڕاستی بەڵام هیچ شتێکی پێنەدا پاشان هات بۆ

لای لەلای چەپی بەڵام هیچ شتێکی پێنەدا پاشان هات بۆلای لە پشتەوەی بەڵام هیچ شتێکی پێنەدا .

جا وتی : ئەی محمد ﷺ دادپەروەر نەبووی لەمڕۆوە لە دابەشکردندا .

جا رسول الله ﷺ تووڕەبوو تووڕەبوونێکی زۆر پاشان فەرمووی : (سوێند بە الله تعالی هیچ یەکێك نادۆزنەوە دادپەروەرتر بێت لە من)، سێ جار .

پاشان فەرمووی : (پیاوانێك لەلای ڕۆژهەڵاتەوە دەردەچن لەسەرتان ئەوە لەوانە، شوێنی ئەوە دەکەون، قورئان دەخوێننەوە لە گەردنیان تێناپەڕێت لە دین دەردەچن وەکو چۆن تیر لەوە دەردەچێت کە ئاڕاستەی دەکرێت ناگەڕێنەوە بۆی)، وە دەستی لەسەر سنگی دانا (نیشانەیان سەرتاشینە بەردەوام دەردەچن هەتاوەکو کۆتا کەسیان دەردەچێت لەگەڵ مەسیحی دەجال، جا کاتێك ئەوانتان بینی بیانکوژن بە جلوبەرگی ڕووکەش و سیفاتی جەستەیان)، سێ جار فەرمووی .

---

واتە لە ڕووکەش کەسانی دیندار خۆیان دەردەخەن، وەك لە فەرموودەکەش باس دەکات کە قورئان ئەخوێننەوە بەڵام لە قوڕگیان تێناپەڕێت، کەچی لەڕاستیدا ئەوان لە دین دەرچوونە، والله اعلم .

**١٩٦** - حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ الْقَوَارِيرِيُّ، حَدَّثَنَا مُعَاذُ بْنُ هِشَامٍ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ عُقْبَةَ بْنِ وَسَّاجٍ قَالَ: حَجَجْتُ فَلَقِيتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَمْرٍو .

قَالَ: أَتَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِسِقَايَةٍ مِنْ ذَهَبٍ، وَفِضَّةٍ، فَجَعَلَ يَقْسِمُهَا بَيْنَ أَصْحَابِهِ، فَقَامَ رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ الْبَادِيَةِ، فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ وَاللَّهِ لَئِنْ كَانَ أَمْرُكَ أَنْ تَعْدِلَ مَا أَرَاكَ تَعْدِلُ .

قَالَ: «وَيْحَكَ، فَمَنْ يَعْدِلُ عَلَيْكَ بَعْدِي» .

قَالَ: «فِي أُمَّتِي أَشْبَاهُ هَذَا يَقْرَءُونَ الْقُرْآنَ لَا يُجَاوِزُ تَرَاقِيَهُمْ، كُلَّمَا خَرَجُوا، فَاقْتُلُوهُمْ فَاقْتُلُوهُمْ»، قَالَهَا ثَلَاثًا .

**١٩٦** - عقبة ــی کوڕی وساج دەڵێت : حەجم کرد جا گەیشتم بە عبد الله ی کوڕی عمرو رضي الله عنهما .

فەرمووی : قاپێك زێڕ و زیو هێنرا بۆ رسول الله ﷺ جا دابەشی دەکرد لە نێوان هاوەڵەکانی، جا پیاوێکی دەشتەکی هەستا و وتی : ئەی محمد ﷺ والله ئەگەر فەرمانەکەت دادپەروەر بێ وانابینم دادپەروەربێت .

فەرمووی : (هاوار بۆ تۆ کێ دادپەوروەر دەبێت لەسەرت لەدوای من) .

فەرمووی : (لە ئوممەتەکەم هاوشێوەی ئەوە قورئان دەخوێننەوە لە گەردنیان تێناپەڕێت هەرکاتێك دەرچوون بیانکوژن بیانکوژن)، سێ جار فەرمووی .

**١٩٧** - حَدَّثَنَا أَبُو عَبْدِ اللَّهِ مُحَمَّدُ بْنُ مُصَفًّى قَالَ: حَدَّثَنَا عُثْمَانُ بْنُ سَعِيدٍ، عَنِ ابْنِ لَهِيعَةَ، عَنْ بَكْرِ بْنِ سَوَادَةَ، عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «يَأْتِي قَوْمٌ يَقْرَءُونَ الْقُرْآنَ يُقَوِّمُونَهُ كَمَا يُقَامُ السَّهْمُ، وَلَا يُجَاوِزُ تَرَاقِيَهُمْ يَتَعَجَّلُونَ أَجْرَهُ، وَلَا يَتَأَجَّلُونَهُ» .

**١٩٧** - لە سهل ی کوڕی سعد رضي الله عنه لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرمووی : (کۆمەڵێك دێن قورئان دەخوێننەوە و وەك تیرێك ڕاستی بکاتەوە، وە لەگەردنیان تێناپەڕێت پاداشتەکەی پێش دەخەن و دوای ناخەن) .

**کۆتایی کتابی فضائل القرآن والحمد لله رب العالمين و صلى الله على سيدنا محمد النبي سيد المرسلين و آله وأصحابه أجمعين**

https://t.me/KitabSalaff